هەڵـ ... ی یاسط حەمەغەریب

# دیوانی شاری

## سەرجەم شیعرەکانی عەلی عارف ئاغا

ئامادەکردنی: ئەحمەد حسێن ئەحمەد

# دیوانی شاری

# سەرجەمی شیعرەکانی

# عەلی عارف ئاغا



ئامادەکردنی

ئەحمەد حسێن ئەحمەد

<u>پێناسی کتێب</u>

ناو کتێب: دیوانی عەلی عارف ئاغا

بابەت: دیوانە شیعر

ئامادەکردنی: ئەحمەد حسێن ئەحمەد

دیزاینی بەرگ: فەرهاد

چاپخانە: چوارچرا

نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارە ( ١٤٤٨ ) ساڵی ٢٠١٢ پێدراوە

## وشە گەلێك بۆ بیرخستنەوە

ئەم کۆ دیوانە لە بەر دەستی ئێوەی خوێنەری بەڕێزدایە، یادگار و شوێنەواری ئەدەبیی شاعیرێکی هەست ناسك و ئەمەکداری شاری سلێمانییە، نازناوەکەشی (شاری) یە. ئەم زاتە لەناو بنەماڵەیەکی دێرین و ڕووناکبیر و ناوداردا چاوی کردۆتەوە و پەروەردە بووە. هەر لە سەرەتای لاویەوە تێکەڵ بە جیهانە فراوان و بێ سنوورەکەی شیعری رەسەن و کلاسیکی بووە. پلەی تواناکەی لە ریزبەندی مام ناوەندیدا خۆی دەبینێتەوە ئەمەیش جۆرە پێشکەوتن و سەرکەوتنێکە بۆ ئەو ئامانجە بنەڕەتی و پیرۆزەی کە لەمێژەوە دروشمەکەی هەڵگرتوە و خولیای بووە. کەم و زۆر لەگەڵی رۆیشتوە. شیعرەکانی شاری تێکڕا سەهلی مومتەنیعن واتا بە رواڵەت ئاسان. هەموو جارێ خۆی دەیوت: ئەمە ئاستی منە. حەزم لە شیعری ئاڵۆز و قورس نییە چونکە هەست و مێشك ماندوو دەکەن بۆیە ئەم رێچکەیەم هەڵبژاردوە لەسەری دەڕۆم.

***

مامۆستا عەلی عارف ئاغا وەك ناوێکی دیار لە نێوەندی شیعردا دەنگی داوەتەوە. لە چەندان بواردا ئەسپی وشەی تاوداوە. تەمەنی بۆ مانەوەی بیرۆکە و دارشتنە ئاساییەکانی هێشتۆتەوە و ناسراوە. بە راشکاوی کەوتۆتە سەر زمان. هەرچی بواری ئەوینە بەشی شێری لە دەقی هۆنراوەکانیدا بەرکەوتوە و ئەوەندە لەو پێناوەدا تواوەتەوە بە ڕادەیەك ئەگەر چەندان و دەیان سەدە ناوی شەیدایانی وەك مەجنون و فەرهاد و بێژەن و وامیق و مەم و وەلی دێوانە... تاد لە بەردڵاندا بووبن، ئەوا لەم سەردەمە نوێیەدا شاری جێیان دەگرێتەوە. بۆ ئەم بۆچونەمان سەدان بەیتی ئاگرینی عەشق لەناو غەزەلەکانیدا رەچاو دەکەین. خوێنەر دەتوانێت کێومالّیان بکات. هەرچی بواری نیشتمانی و کۆمەڵایەتیشە

ئەوا بێ سێ و دوو بە تروسکەی هەڵوێستەوە جێگەی خۆیان کردۆتەوە و پەلیان هاویشتووە لەهەمان کاتدا ڕێگەی چارەسەریان خستۆتە بەر دیدی هاوولاتیانەوە. مرۆڤی نیشتیمان پەروەر و خزمەت گوزار لای شاری پیرۆزیەکی هەرە گەش و پایەیەکی دیار و سەختی هەبووە لە ناخەوە ستایشی کردووە. لەڕووی لاواندنەوە و بەسەر کردنەوەی ئازیزان و لەدەست چوانەوە، خوێنەر والێدەکات بەشداری پەژارە و فرمێسك رشتن و بەدوادا چوون بکات. لە پیا هەڵدانیشدا ئەوەی مەبەستی بووە پێکاوێتی. شاعیرێ لەسەرەتای لاوییەوە تا ئەو دەمەی پیری تەنگی پێ هەڵچنی و نەخۆشی بەرۆکی گرت، لەو ڕێبازانە لای نەدا. لەگەڵ ئەوین و هیوادا ژیا. هەموو ئاواتێکی چەسپاندنی یاسا و بنەمای یەکسانی و ئاشتی و سەربەخۆی و سەرفرازی کورد و کوردستانەکەی بوو. بیرەوەریی زۆرم لەگەڵیدا هەبوو تۆمارم کردوون و بەشێکیانم لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا بلاو کردۆتەوە.

***

لە رووی سەرنج و تێبینیەوە دەبێت وەك هزری ئامادەکاری ئەم کۆ دیوانە ئەو هەستەش دەربڕین، بەشێك لە شیعرەکان لە کەم و کوڕی بەدەرنین تاك و تەرا لە هەندێ شەترا لەنگی یان کەم و زیادیان پێوە دیارە، بەلام ئێمە دەست نوسەکەی پێشومان لەبەر دەستدا نەبوو، یاخود بەسەر شاعیر خۆیدا تێ پەڕیون، جگە لە سادەیی و دوبارە بونەوەی چەندان دەق و مەبەست لەوانە هێنان و تێهەڵکێش کردنی هەندێ زاراوەی دوور لە جیهانی شیعر بۆ زیاد بوونی ژمارەی لاپەڕە و غەزەلەکان بەرجەستە کراون بەشێوەیەك کەپێویست نەبوون. هەروەها لەپێناوی سەروادا گەلێ جار واتای بەقوربانی شیعرەکە کردووە.. نمونەمان لەم بارەیەوە بەرچاو دەکەوێ. لەگەڵ ئەمانەشدا شیعرەکان تەڕاییان لێ نەبڕاوە و لەسەر زمان خۆش و ئاوێتەی هەست دەبن.

***

مامۆستا عەلی عارف ئاغا مرۆڤێکی کراوە و قسە خۆش و نوکتەباز و دنیایی بوو. هەردەم نوکتەی ئەدەبیی کۆن و سەردەمیانەی بەشێوازە خۆشەکەی دەگێڕایەوە. جگە لەوەش خاوەن بیرۆکەیەکی ورد و سەلیقەیەکی بەهرەمەندانە بوو. بۆنە و تێکەڵاوی شاعیران و نوسەران و کەسایەتییە کۆمەڵایەتی و ئاینیەکانی بەویژدانەوە دەگێڕایەوە و باسدەکرد. زۆر قینی لە درۆ و خۆ هەڵکێشان و لوت بەرزی دەبووەوە. وەك چۆن بە راستگۆیی و دڵپاکی ڕاهاتبوو، هەروا بەو دوو سیفەتە خاوێنەوە سەرینایەوە. لەجێی خۆیدایە ئەم بیرخستنەوەیە بخەمەڕوو.. ئەگەر ڕەخنەت لە شیعرەکانی بگرتایە بە سنگێکی فراوانەوە وەریدەگرت. کاتێ کە دیوانی شیعری (بەرهەمی خاوێن)م بۆ نوسیەوە ناردبووی بۆ مامۆستا فەرەیدون عەلی ئەمین لە بەغداد پیادا چووبووەوە چەند غەزەلێکی سادەی عەرەبی تێدا بوو لەگەڵ یەك دوو پارچەی کوردیدا لای بردبوون ئینجا ناردبووی بۆ وەرگرتنی ژمارەی سپاردن لە کتێبخانەی نیشتیمانی لە بەغداد ، منیش پێم وت مامۆستا لەبەر چی بوو ئەو کارەی ئەنجام دابوو لە وەڵامدا وتی: م.فەرەیدون هەم شاعیرە هەم نوسەرە هەم شارەزایە وتبووی: ئەو شیعرانە لەئاستی شاعیر کەمدەکەنەوە واچاکە لەو دیوانەدا دەربهێنرێن. هەرەدەم رەخنەی بابەتی پێ باش بوو. دەیوت: کوڕینە ئەگەر رەخنەگر نەبێت هەندێ شاعیر و نووسەر شووڵی بێ دەربەستی و سەرەڕۆیی لە بابەتەکانیاندا لێهەڵدەکێشن و زیادە رەوی دەکەن.. بۆیە دەڵێم ئافەرین بۆ ئەوانەی رەخنەی شیاو و دروستکار دەگرن و پەیڕەوی دەکەن.

***

لەم سۆنگەیەوە بیرمان لە کۆ دیوانێکی سەرجەمیانە کردەوە بەو مەبەستەی ئەو سێ دیوانە شیعریەی لەمەو پێش لەچاپدراون (چەپکێ گوڵ و خونچە — بەرهەمی خاوێن — ئاشنایی و ڕۆشنایی) لێکیان بدەین تا تینوێتی خوێنەر بشکێنن. وامان بەباش زانی، ئەم ئەرکە پیرۆزە جێ بە جێ بکەین.. ئەویش بەهاوکاری نەوە بەڕێزەکانی کە دڵسۆزانە و ئەمەکدارانە پێشوازیان لێکردین... شاعیرێك خاوەنی ئاوا نەوەیەك بێت، بێگومان داهاتووی بەرهەمەکانی دەبنە ئەستێرەی ئاسمانی شار و دەدرەوشێنەوە. بۆیە لەجێی خۆیدایە پڕ بەدڵ سوپاس و پێزانینی خۆمان دەربڕین بۆ بەڕێزان: خاتو نەرمین عەلی عارف ئاغا، کاك ئاسۆس فەرهاد عەلی عارف ئاغا و ئەوانیتریش، چونکە گیانی شاعیریان دووبارە شاد کردەوە. بە ئومێدی ئەوەین نموونەیان زۆربێ و چاویان لێبکرێت. ئەوەی ماوە بڵێین لەوانەیە (شاری) چەندان پارچە شیعری تری پەڕاگەندەی هەبێت بۆ داهاتوو لەلایەن خەمخۆرانی ئەدەبەوە بخرێنە روو. هەروەها لەلایەن شاعیران و نوسەرانەوە گەلێ بابەت و چاوپێکەوتن و لێکۆڵینەوە لەسەر بەرهەمە شیعریەکانی کراوە. ئەوە هەڵدەگرن لەبەرگێکدا یەکبخرێن و لەچاپ بدرێن.. خوێنەری خۆشەویست فەرموو سەرجەمی شیعرەکان لە بەرگێکدایە گەشتی خوێندنەوەی تێر و تەسەلی خۆتی بە سەرنجەوە تێدا بکە...

**ئەحمەد حسێن ئەحمەد**

**٢٠١١/٩/٨**

**سلێمانی**

بۆ لایەنی پەیوەندیدار

بابەت/ ڕێپێدان

ئێمە وەکو بنەماڵەی شاعیری ناسراوی کورد علی عارف ئاغا هیچ لاریمان نییە کە بەڕێز مامۆستا أحمد حسین شاعیری ناسراو هەستێت بە چاپکردنەوەی هەرسێ دیوانەکەی شاعیر علی عارف ئاغا بۆیە بەم نووسراوە ڕەزامەندی خۆمان پیشان ئەدەین وە ڕێگر نین لە هیچ بەرامبەر ئەم کارە بگرە بە کارێکی پیرۆزی دائەنێین وە سوپاسی مامۆستا أحمد حسین ئەکەین بۆ ئەو ماندووبوونەی کە بەم کارە هەڵدەستێت لەگەڵ ڕێز و احترامی بنەماڵەکەمان.

ئاراز فرهاد علی — ئاسۆس فرهاد علی عارف — نرمین علی عارف ئاغا

٢٠١١/٩/٢٠

عەلی عارف ئاغا
«شاری»

# چەپکێ



# گوڵ و خونچە

سلێمانی ١٩٨٥

چاپخانەی ئۆفسێتی سەرکەوتن - سلێمانی

# عەلی عارف ئاغا ((شاری))

## چەند ووشەیەکی پێویست

ئەو برا و خوشکانەی کە ئەم دیوانی شیعرەیان دەسکەوت ئەیانەوێ خاوەنەکەی بناسن هەتا بزانن کێ یە و چیە و چی لەبارایە و ئایا چ نرخ و توانایەکی هەیە لە جیهانی شیعر و ئەدەبدا. ئینجا ئەوا زۆر بە کورتی خۆم بەم برا و خوشکانە ئەناسێنم.

ناوم عەلی کوڕی عارف ئاغای کوڕی عزیز ئاغا. لە بنەماڵەی ئاغا تەهام. لە ساڵی ١٩١٠ هاتومەتە دنیاوە. خوێندنم هەتا قوتابخانەی ناوەندی (متوسگە) تەواو کرد. لەبەر کەم دەستی باوکم نەمتوانی بچمە بەغدا بۆ تەواو کردنی (تحصیلی) سانەوی و کلیە. لەساڵی ١٩٣٤ دا کرام بە نوسەر لە دادگای سولەیمانی.لە ساڵی ١٩٥٨ دا لەبەر هەندێ هۆی خێزانی و صحی تەقاویت کرام.

هەر لە مناڵیەوە حەزم لە شیعر خوێندنەوە ئەکرد. باوکم کۆمەڵە شیعرێکی زۆری (نالی و کوردی و سالم و شێخ ڕەزا و وەفایی و خەستە ) وە گەلێ شاعیری تری نوسیبۆوە. موتالای ئەو شیعرانەم ئەکرد، وە ئەمە زۆر جار هەستی ئەجولاند و پاڵی پێوە ئەنام کە شیعر دابنێم.

ئەو شیعرانەی کە نیشانی مامم (احمدی عزیز ئاغا) ئەدا پێ ئەکەنی گاڵتەی پێ ئەکردم بەڵام من کۆڵم نەدا هەتا ڕۆژێك پارچە شیعرێکی خۆمم برد بۆ مامۆستام زیوەر، خوێندیەوە و وتی عەلی ئەم شیعرە زۆر جوانە ئومێدم هەیە کە سەرەتای پێ گەیشتن و سەرکەوتنت بێ لە دنیای ئەدەبا.

شیعرەکانم لەسەر شێوەی کلاسیکیە. لەسەرەتای لاویمەوە زۆر دڵبەند (معجب) بووم بە نالی و کوردی و سالم و شکری و شێخ ڕەزا و زێوەر و بێ کەس و حەمدی و بەشاعیرەلاوەکانی وەکو هەردی و دڵدار و هێمن و کامەران و ئەخۆل.

بەداخەوە لەگەڵ شیعری ڕوانگەدا هیچ ئاشنا نیم هەرچەندە گەلێ لە شیعری لاوەکان لەم بابەتەوە زۆر جوان و پەسەندە.

لەکۆتایدا زۆر سوپاسی کاك محمد قفگان ئەکەم کەیاریدەی دام بۆ چاپکردنی ئەم دیوانە کە تەنها بریتی یە لە هەڵبژاردەی شیعری دڵداری. شیعرەکانی تر کە کۆمەڵایەتی و وڵات پەروەری و چەند شین نامەیەکە ئەگەر یەزدان یاریدەم بدا لەدواڕۆژ بۆ چاپکردنیان ئەوا مایەی شادی یە.

**عەلی عارف ئاغا**

**١/ئەیلولی ١٩٧٩**

# گوڵ و خونچە

گوڵ و خونچەی بەهارانیش لەتۆ نەشمیلەتر نابێ
نەمامی عەرعەری کۆرپەش لە تۆ خنجیلەتر نابێ
لە عالەما لەتۆ چاتر، لەتۆ مەحبوب و شیرین تر
ئەگەر دەعوا چیەك مابێ درۆ ناکا دەسا بابێ
دەسا بابێن بە صەف یەکسەر هەموو چاو مەست و گوڵ ڕومەت
بزانین چۆن ئەبێ مەحبوب ئەوی والافی لێدابێ
درۆیە تۆ لە ئینسان بی ئەمە عەقڵم قبوڵ ناکا
پەریش حەدی نیە وابێ ئەبەد حۆریش بەتۆ نابێ
کەوابوو تۆ لە شوعلەی نوری پاکی صونعی یەزدانی
ئەبێ جێگای ئەصلیشت عەتارید یا سورەییا بێ
بتی تۆ ئەتپەرستم من عیبادەت بۆ کەسێك ناکەم
ئەگەر چی ئاگری جوملەی جەهەننەم بۆم لەکارا بێ
ئەوا سوتام گڕم تێبەربوو گیانە بمگەری توخوا
بەماچی تۆ نەبێ والله برینی من دەوا نابێ
بەلەنجە و ناز و غەمزە و عیشوەی ڕەفتار و گوفتارت
هەزاران فیتنەها ناحەق نیە گەر بێت و بەرپا بێ
بەلامانا کەنایەی باکی قەهری خوات نیە زاڵم
زەمانە هەروەها نابێ هەتا چەندساڵی باوابێ

***

# دڵ چی یه

دڵ چی یه بەحری غەمی ڕوخساری فەتتانی ئەوە
گوڵ چیه هەمرازی لێوی ئاوی خەندانی ئەوە
ئەو چیه سوڵتانی عەشقی کائیناتو عالەمە
ڕۆح لەبەر هەرچی ئەبینێ ڕۆح پەرێشانی ئەوە
ڕۆح چیه ئەو حەمادێکە لەسەر سەحرای وجود
من ئەڵێم هەر لائیقی بەردە بارانی ئەوە
منْ چ نیم فەردێك لە زومرەی وەحشیانی عالەمم
صەد من صەد تۆ لە ئانێکا بەقوربانی ئەوە
صەد چیه دوو صەد، هەزاریش بن بە قوربانی کەمە
چونکە خوای عەشقە جیهان گشت عەبدی فەرمانی ئەوە
عالەم و ئادەم بە بە ئازاد و بە کۆیلە و عەبدەوە...
یەك کەرەت ئەڵقە بەگۆش و شێتو حەیرانی ئەوە
ئەم سوئالانەم لەگەڵ ڕەددی جواب و شەرحیا
بێ گومان قانونی وەصفی حوسن و ئیحسانی ئەوە
***

## شەرتە

شەرتە وا بگریم بە کوڵ شەرمندەکەم هەوری بەهار
وا بناڵێنم بلەرزیٚ عەرشی بەرزی کردگار
وا لە چاوانم ڕەوانکەم سەیلی فرمێسکی بەخوڕ
غەرقی تۆفانکەم سولەیمانی هەتاکو قەندەهار
وا حەزینانە بەیانکەم شەرمی ئالامی فیراق
مورغ و ماهی شێتو داهی بێنمە گریان و زار
وا کەساسانە لەژێر باری غەما ملکەچ بکەم
قەیس و فەرهادیش نەیانمێنیٚ لەچاوما ئیعتبار
وا هەناسەی ئاگرینم بێنمە جۆش و خرۆش
گڕ لە عەرش و چەرخی گەردون بەربدەم بیٚ باك و عار
چونکە بەدبەخت و هەژار و عاجز و میحنەت زەدەم
شیعرەکانم بۆیە خوێنی جەرگی پێدا دێتە خوار
***

# مەسوتێنە

بە شوعلەی ئاگری عەشقت دڵی زارم مەسوتێنە
چی یە تاوانی من ئەندامی بیمارم مەسوتێنە
تەماشای ڕوی گوڵی تۆ گەورەتر ئاواتمە بەخوا
دەسا یانەی ئومێدی بەرزی ساکارم مەسوتێنە
ئەوەی نیمە و هەمە هی تۆیە بۆ تۆیە لەبەر تۆیە
زیان بۆخۆتە گیانە دین و دینارم مەسوتێنە
لەسایەی تۆیە سەرداری هەموو عوشاقی گەردوونم
فیداتبم ڕۆحەکەم دیوانی کۆمارم مەسوتێنە
لەخوا بەولاوە تەنها هەر ئەتۆی قیبلەی عیبادەتمی
دەسا میحرابی قیبلەی ڕۆژ و شەوگارم مەسوتێنە
***

# خۆزگە

خۆزگە دڵسۆزێ کە پرسێکی لەحاڵی من دەکرد
سەیری بێ چاری و کەساسی و ناڵە ناڵی من ئەکرد
خۆزگە پەنجە ناسکێ دەستی ئەخستە سەر ملم
زۆر بە شیرینی کە چارەی ژینی تاڵی من ئەکرد
من گیانم پێشکەش کردۆ لەگەڵ سامان و سەر
ئەو کەچی گاڵتەی بەگیان و حاڵ و ماڵی من ئەکرد
گەر کەمێ باکی لەئاهی دڵبرینداران ئەبوو
ڕەنگە ڕەحمێکی بەجەرگی وەك زوخاڵی من ئەکرد
***

# له مزگەوتا

لەمزگەوتا کەدەرچووم بێوچان ڕووم کردە مەیخانەش
کەپەیمانم شکان و نۆشی خوم کرد یەکدو پەیمانەش
لەلای مەیخانە چی دامنا لە ڕەهنا مێزەر و بەرماڵ
لەگەڵ خەرقە و عەصادا تا عەبا و تەسبیحی صەد دانەش
لەڕێی بەدناویا فەوتا بەجارێ ماڵ و سامانم
فرۆشتم هەرچی هەم بوو تاکو جامە و جام و جامانەش
بەدوای یاردا گەڕام شارانی عالەم تاکە بی بینم
لەئاکۆ تاکو باکۆ چومە تاران و سنە و بانەش
بەڵام بەختی بەدم هاودەم بۆ یارم نادیاری بوو
بەجارێ بوومە نیشانەی فسانە و مەسخەرە و تانەش
وەکو مەجنوونی سەرگەردان سەرم یەکبازە لێ شێوا
لەدەستم چوو کەمال و حال و مال و حورمەت و لانەش
***

# گوناهم کرد

گوناهم کرد دولبەر بەخەنجەر پارە پارەم کە
ودیا وەك خائینی دەوڵەت حەواڵەی سەر قەنارەم کە .
گوتومە تۆ گوڵی نەرخم شکانووی من گوناهبارم
نەخۆشی عەقڵ و هۆشم سا بە کوشتن زووبە چارم کە
لەپەروازایە ڕۆحم وەك فریشتەی زاتی یەزدانی
لەبەردەمتایە ئامادە بەتەنیا یەك ئیشارەم کە
ئەگەر بمبەخشی لەم تاوانە قەت ڕوم نایە بت بینم
دەسا لەم ژینە پەستە هەستە لەم شارە پەژارەم کە
ئەڵێم دووربم لەتۆ ڕەنگە ژیان ئاسودەبم ئیتر
بەڵام هەردێمەوە تۆ سەیری ئەم عەقڵە هەژارەم کە
***

# گیانەکەم

گیانەکەم گیانم فیدات بێ بۆچی بێزاری لەمن
چی هەیە تاوانی من بۆچ دڵ بە ئازاری لەمن
خۆم بە کۆیلەی تۆ ئەزانم تا لەدنیادا بژیم
تیر و تانەی ناحەزان ناکا ئەبەد کاری لەمن
مەحرەمی ڕاز و نیاز و ڕاگری نازی ئەوم
بۆچ لەمن پەنهان ئەکا ئەم شۆخە ئەسراری لەمن
ناحەزی ناکەس بسوتی با بەسۆزی ئاخ و داخ
چارەی ناکەم با بکا صەد دەفعە هاواری لەمن
باغەوانی باغی شادی یار هاوڕازی منە
ئیکە چۆن دائەخا ئەو باغ و گوڵزاری لەمن
دوشمنم گەرچی بەچاکی خۆی نیشانی من بدا
تەفرە ناخۆم ئاشکرایە کار و کرداری لەمن

***

## تۆ کە دەرکەوتی

تۆ کە دەرکەوتی لەناو باغا گوڵی مینا چییە
یا لەچاو جوانی ئەتۆ شیرین چییە و لەیلا چییە
نرخی تۆ تەقدیر بە پارە و زێر و ئەڵماس ناکرێ
بۆ فریشتەی ئاسمانی سەروەتی دنیا چییە
تۆ کە شازادەی جوانانی هەموو ئەم عالەمەی
کەس نیە لافی هەبێ میر و بەگ و ئاغا چییە
گیانی ئێمە پێشکەشی تۆبێ قبوڵی گەر ئەکەی
بۆ دیاری گیانی بێ نرخی منی ریسوا چییە
***

# پەری روو

پەری روو تۆ ئەچی بۆ تەعزیەی پیرێکی کۆچ کردوو
نەزەر ناکەی لە ئەحوالی منی بۆ چاوی تۆ مردوو
ئەروی وەك ئاسك و ناپرسی بۆچ لەم رێگە وەستاوی
ئەلێی ونبە لەبەر چاوم ئەتۆش بمرە (یەکەن دەردوو)
ئەوەی چاوت بە ئێمەی کردووە باوەڕ مەکە بیکا
لە جەنگی ڕوس و ئەڵمانا بەشاری (ئۆدیسا)هۆردوو
ئومێدم وابوو تاماوم نەبەخشی دڵ بە غەیری من
بەلاّم فەوتا بە ناکامی دڵ و ئومێدی بابردوو
لەمن بێزاری ئێستاکە وەکو نەمدیوی و نەم ناسی
لەبیرت چۆتەوە دیارە مەگەر رۆژانی رابردوو
لە گوڵزارا من و بولبول ئەمان نالاّن لە عەشقی گوڵ
ئەوا ڕێگەی فەنامان گرتەبەر بێ بەش لەگوڵ هەردوو
***

## کاشکی

گیانی من ڕۆژێ لەخەم بێبەش بوایە کاشکی
باغی ئومێدی ژیانم گەش بوایە کاشکی
دائیما دوو چاری نەحسم من لەسەر نەردی ژیان
بەختەکەم ڕۆژی بەشی دوو شەش بوایە کاشکی
ناحەزم هەردەم خەریکە من لە دڵدارم بکا
زەحمەتە قەت سەرکەوێ ڕوی ڕەش بوایە کاشکی
من کە بادەی سادە ناخۆم دیارە خۆ بێ سرر نیە
شادی نابەخشێ بەدڵ بێ غەش بوایە کاشکی

***

# چ خۆشە

چ خۆشە نیوەشەو دەستم لەگەردن گوڵ عوزارێکا
بەجێ هێنانی باخی دڵ لەباغ و لالەزاریکا
چ خۆشە دابنیشم یار ئەنیسم لەگەڵ بادە
ژیانی واخۆشە رابورێ لەهەر بەزمی خومارێکا
چ خۆشە هاودەمم یاربێ لە هەر ساتێ لە هەر کاتێ
لە هەر یانە و حەسارێکا لە هەر دێهات و شارێکا
چ خۆشە ئارەزووی دڵ گەر ڕەوابێ چۆن بە مەیلم بێ
لەناو باغ و نزاریکا وەیا کۆشك و تەلارێکا
چ خۆشە ماچ و مەزەی مەی بێ ژیان بێ رەنج و بێ وەی بێ
لە جەژن و بەزمی یارانا بە نەشئەی عود و تاریکا
چ خۆشە بەهرەدارێتی لەسامان و لە یارێتی
لە هەر وەخت و زەمانێکا لە هاوین و بەهارێکا
چ خۆشە غەم تەریکم بێ صەفا یار و شەریکم بێ
نەزاکەت دار نزیکم بێ لەهەر رەفتار و کارێکا
چ خۆشەهەروەکو ساوا غەمی مردن لەدڵ دەرکەم
بەبێ غەم راکشێم بۆخۆم لەژێر سایەی چنارێکا
چ خۆشە ناکەس و ناحەز هەژار و پەست و ریسوابن
منیش خەندان و شادان بم لەگۆشەی مێرغوازێکا
چ خۆشە زەمزەمەی ڕەخنەت زەماوەند و صەفا و عوشرەت
لەگەڵ یارانی خۆش ئولفەت لەیانەی بەختیارێکا

***

## تەلاری قەسرەکەی

تەلاری قەسرەکەی بەرزە گەلێك دڵدارەکەم توبا
ئەچم ناچاریە بیشم کوژی باران و بەفر و با
نیە هیزی بەرامبەر هیزی دڵداری بوەستی قەت
خسوسەن بۆ ئەوانەی هەر کەوا غەرقن لە ئاشوبا
نیگارم پرتەوی نوری خودایە ئێوە سەیری کەن
چ دڵدارە چ شیرینە لەکاتی نۆشی مەشروبا
لەدەریای پڕ شەپۆلا کەشتی ژینم هەر لە کارایە
لەدونیا تاك و بێباکم منیش وەك دەرڵەتی کوبا
لەلای من کاری دڵداری چلۆن بیّ وەك خەڵات وایە
لەمێژە من کەڕاهاتووم لەگەڵ کرداری مەحبوبا
***

# دەرخە ئەو چاوانە

دەرخە ئەو چاوانە ئەم چاوانە با روون بێتەوە
با دڵی ناپاکی ناحەز مات و مەحزون بێتەوە
تۆ کەلەیلاکەی لە عالەم تاکو هاوشانت نیە
خۆت نیشاندە بۆ تەماشات بەڵکو مەجنون بێتەوە
شادمانی و ڕووگەشی بێ با شعاری دولبەریت
ڕێ مەدە بۆ هاودەمی شەیتانی مەلعون بێتەوە
گەر فریشتانی بەهەشتی دەربچن لەم گوڵشەنە
دوور نیە بۆ بەختی ئێمە خاتو مەیمون بێتەوە
وا لە زیندانی غەما بەندم بەبێ چاری ئیتر
تا بەهار دێت و دەمی نەسرین و بەیبون دێتەوە

***

## رەنجی بەباچوو

ئەگەر رەنجم بەبا نەچوایە بۆ دەسکەوتی ئاواتم
سەراپا بۆ بەختیاری بۆ لەژینا من هەموو کاتم
ئەگەر ئەو یارە نەشکایە دڵی لێم بۆچی ئێستاکە
وەها ئاوارەبووی بیابان و شار و خەراباتم
ئەگەر بای وەیشومەی نەگبەت بینای شادیم نەروخێنی
لەبەر چی من وەها مەستو پەریشان و کز و ماتم
ئەگەر یاران وەکو جاران بیانمایە وەفا و پەیمان
لەعەرشی بەرزی یەزدانا ئەبوو خۆشی هەموو ساتم
ئەگەر دێوی نەهاتی لائەدا لێم سێبەری شومی
ئەزانم چۆن ئەکەم پەیدا فریشتەی رووگەشی هاتم
***

# سەرچنارم دی

سەرچنارم دی بەڵام داخی گران یارم نەدی
باغو گوڵزارم بەدڵ بوو هەر گوڵی زارم نەدی
ئاوی سارد و سێبەری فێنك دڵی حەیران ئەكرد
فایدەی چی ناز و عیشوەی جوانی دڵدارم نەدی
ساز و ئاوازی گەڵێ شیرین هەبوو زۆر دڵرفێن
زەمزەمە و بەزمی بەجۆشی شۆخی نازدارم نەدی
كۆمەڵێ جەم بۆ بوێژ و شاعیرانی پڕ هونەر
گەرچی لەم سەیرانە مەیلی گەرمی پڕ ئەشعارم نەدی
هەر منی بێ چارە تەنها دوور لەیار و بادە بووم
چارەسازی گیانی پەست و سست و بێچارم نەدی
***

## بۆچی باشە

بۆچی باشە گیانی من با هەر فیدای ئەو چاوە بێ
کەڵکی چی دێ مانی من بێسودە یا لەولاوە بێ
پێم بڵێن نەرخی چی یە بۆ خاوەن و بۆ خەڵقی تر
ئەو ژیانە پڕ لەژان و هاوسەری ئاژاوە بێ
گیانەکەم گەر ئێوە ئەمڕۆ مەیلی نۆشی مەی ئەکەن
با مەزەت بۆ مەی بەقوربان ئەم دڵە برژاوە بێ
من لەڕێ ی دڵداریا پێم خۆشە دانێم ڕۆح و سەر
باسی پێناوێ ژیانم با فەوتی لەم پێناوە بێ
بێستون گەر هەڵکەنم بۆتۆ ئەبەد باکم نیە
کاری فەرهادی دەبا پیشەی منی چەوساوەبێ
***

# هێرشی غەم

پێم ئەڵێن گۆرانی خۆش داخی دڵی پێ لائەچێ
ئەم قسە بێ هودەیە و بایە بەلای گوێما ئەچێ
هێرشی غەم روو بکاتە کێوی پۆڵا ئەیگرێ
رێگری ئەو هێرشە گەر رۆستەمیشە تیا ئەچێ
جۆگەلەی فرمێسکی چاو تێکەڵ بە خوێنی دڵ ئەبێ
دیارە رووباری بەخوڕ خێرا بەرەو دەریا ئەچێ
من لەڕێ ی ئەو یارەدا کرداری فەرهادیم هەیە
گەرچی زانیومە کەوا ڕەنجم بەهێزی با ئەچێ
بابچم بۆ دەشتەکەی مەجنون کە ڕووی تێکردوە
چونکە هەر ((دڵبەخشەرێ)) بۆ خزمەتی لەیلا ئەچێ
***

# دەربەدەر بووم

دەربەدەر بووم قوربەسەر بووم بیٚ کەس و ئاوارە خۆم .
دلٚ بەداخم کەیلی ئاخم دووری ئەو دلٚدارە خۆم
لانە ویٚران پەست و حەیران شێتی هەرد و دەشت و کیٚوان
دلٚ بە داخم کەیلی ئاخم دوری ئەو دلٚدارە خۆم
لانە ویٚران پەست و حەیران شێتی هەردو دەشت و کیٚوان
وشکە لیٚوم ژەهرە شیٚوم مەسخەرەی ئەم شارە خۆم
کوانیٚ خزمان چارەسازیٚ دەردی دلٚ بیٚت چارەکا
لەم خەراباتی جیهانە عاجز و بیٚچارە خۆم
گەردنم زنجیری زیللەت خوار و لاری کردووە
ئیٚستە وەك زەنجی لە جەنگەلٚ پەت لەمل یەتیارە خۆم
زۆر کەساسم بیٚحەواسم رەنگە رەنگی کەس نەناسم
خاوەنی مەغزیٚکی کاسم رووڕەشی ئەو یارە خۆم
مات و بیٚ هەست و هەژارم پەستی دەستی ڕۆژگارم
ریٚ رەوی بیٚ ئیختیارم وەك دەزووی کۆلارە خۆم
**

## دەسناکەویٚ

دەرد و غەمم زۆرە وەلیٚ چارە و دەوا دەست ناکەویٚ
هەور و تەم زۆرە کەپیٚی لاچیٚ هەوا دەستناکەویٚ
دڵشکاوانی دەستی دڵداری زۆرن بیٚ شومار
بیٚ نەوا جەم بونەوە بۆ نەی نەوا دەسناکەویٚ
رووت و قوت و لات و لوتن دیٚنە مەیدانی ژیان
بۆ ئەمانە قۆندەرە و سەڵتە و کەوا دەستناکەویٚ
نالەبار و ناحەزان خۆیان ئەدەن بۆ شەڕ حەشار
داخە بۆ دڵیان هەلیٚکی ناڕەوا دەستناکەویٚ
هەرکەسیٚك هات و چرای بەختی شکا تاریك ئەژی
شەوق و ڕوناکی لە غەمخانە ئەوا دەسناکەویٚ

***

## بەلاما تێ پەڕی

ئەو کچەی ئەمڕۆ وەکو ئاسك بەلاما تێ پەڕی
خۆزگە ئەمزانی بەشەر بوو یا فریشتە یا پەری
چوست و چایوك بێ قسە پرشنگی چاوی خستەکار
هەر بە یەك نیوە نیگا دڵمی دزی و جەرگی بڕی
چووم لەدوای پاڕامەوە بەڵکو دڵم بداتەوە
ئاوڕی هەر لێنە دام و نەیگو چیت و کوێندەری
ئەی خودا لەم شارە بێ جەرگ و بێ دڵ چۆن ئەژیم
چۆن لە گوڵزاری ژیانا بووم لە خۆشی بێ بەری
ئیکە وا چاکە وەکو مەجنون کەوا پەتیارە بم
یا لە هەردە و دەشت و کێوا ببمە هەرزە و سەرسەری
***

# کەشتی ژیان

فەرتەنەی دەریای موحیبەت گێژەدا کەشتی ژیان
گێژە لۆکە و بای غەمیش هاوکاریە بۆ تێك شکان
هەرچی هاواریٚ دەکەم بێهودەیە ئەڕوا بەبا...
وا شەپۆل ئەمبا بە توندی روو بەرەو دورگەی نەمان
تیٚ پەڕی ئیتر کە دەست بگرم بە داوێنی ئەمەلٚ
هەڵوەری غونچەی ئومێدم کەوتە لافاوی خەزان
هیچ کەسیٚ نەیزانی چۆن ئەم کارەساتەم هاتەڕیٚ
چۆن لەڕێی دڵداریا وابووم پەرێشان دلٚ بە ژان
من لەسەر ئەم خاکەدا بەم حاڵە ژینم بۆ چی یە
ئەی خودا ئەم گیانە لاتەی من بەرەوە بۆ ئاسمان
***

# ئاوازی ناساز

ئەوەی ئاوازی ناسازە ئەبیٚ دوربیٚ لەتەك سازا
ئەوەی ڕەوتی وەکو قازە ئەبیٚ نەفڕیٚ لەتەك بازا
ئەوەی پێچ و پەنای زۆرە شەقامی ڕاستی لاچەوتە
ئەبێتە کۆسپی  ڕێبواران کەوا بڕوا بە ڕێبازا
ئەوەی بێکار و بێچارە دەستی ناگاتە ئاواتی
مەلێك باڵی شکا نابیٚ ئیتر مەیلی بە پەروازا
ئەوەی هەوڵێك نەدا ئەمڕۆ و سبەینیٚ برسیە و ڕووتە
سەری زۆر بەرزە تێکۆشەر ئەژی زۆر چابوك و ئازا
ئەوەی نازداری دایکی بوو کە باوکی کۆچی دنیای کرد
کەساس و کاسە ئێستاکە لەگەڵ بێکار و بیٚ نازا
***

## چرای ژیان

چرای ژیان بەبێ گومان ئەکوژێتەوە
بڕوا مەکە جارێکی تر هەڵ کرێتەوە
چرای ژیان شوشەی شکا لێك هەڵوەشا
ئیتر چلۆن ئومێد ئەکەی چاك بێتەوە
هەر درەختێك کە وشك بوو ڕەگ و ڕیشەی
ئاوی زەڵمی بکەیتە ژێر ناژێیتەوە
هەرچی فەوتا دیارە چووە بەرەو عەدەم
تەنها ناوە هەر ئەمێنیٌ و نابڕێتەوە
ناویش مەگەر بۆ هەموو کەس باقی نابێ
بەدخوی ناکەس با زیندوش بێ ئەتوێتەوە
پیاوی خائین وولاٌتی فرۆشت بۆ زێر و زیو
لە تەویلەی پیسی مێژوو ئەتلێتەوە

***

## ئەوەی کە نۆشیم

ئەوەی کە بەخشیم گیانی شیرین بوو
ئەوەی کە نۆشیم تاڵاوی ژین بوو
ئەوەی کەوا دیم دیمەنی غەم بوو
ئەوەی کەناسیم دێوی ستەم بوو
ئەوەی توشی بووم دەرد و بەڵا بوو
ئەوەی بۆی ئەچووم ڕێگەی فەنا بوو
ئەوەی شکاندم جامی شادی بوو
ئەوەی دڕاندم هەر ئازادی بوو
ئەوەی ویستبووم دوور لە دەستم بوو
ئەوەی ڕستبووم تاوی هەستم بوو
ئەوەی نامەوێ وا هاوبەشم بوو
ئەوەی ناخەوێ بەختی ڕەشم بوو
ئەوەی بەسەر چوو ژینی لاوی بوو
ئەوەی دەرنەچوو دڵشکاوی بوو
ئەوەی کە نووسرا سکاڵایەك بوو
ئەوەی خوێندرا موتالایەك بوو

***

## بیَ بەش لە شادی

بەقوربانی خوابم بۆچی لەشادی بیّ بەشی کردم
لەناو خاوەن دلاّنا شەرمەسار و روو رەشی کردم
لە گولزاری ژیاندا عاشقێك بووم زیرەك و دلسۆز
کەچی ڕوومەت گولّم مەحرومی سەیری رووی گەشی کردم
پزیشکی شاری ئێمە چاری زامی ڕۆح و دلّ ناکا
بەسزمانە تەماشای زام و ئازاری لەشی کردم
فریشتەی بەختیاری هەرکەدیمی دووربەدوور وەستا
کەچی شەیتانی بەدبەختی بە چوستی باوەشی کردم
هەتاکو تۆ ئەهاتی گیانە هاتم بوو لەکۆمەڵدا
بەلاّم کاتیّ نەهاتی زوو نەهاتی فێری غەشی کردم
***

## مژدەبێ لێم

مژدەبێ لێم یارەکەم بۆلای منی بێ چارە هات
چاوەڕێی ئەم هاتنەم دوو ساڵە وا ئەمجارە هات
کارەساتی دڵتەزێنی ساڵی پێشوو تێپەڕی
یار کە خۆی تەشریفی هێنا ئاخری ئەم کارە هات
ڕۆژی ئاواتم لە ڕۆژاوای وڵاتا هاتە دەر
صەد هەزار ئەستێرە سەیرە ڕووبەڕووی ئەم یارە هات
هەر کەیار دەرکەوت لە ئاسۆ لەشکری تاریکی ڕۆی
شەوق و ڕووناکی بەجارێ بۆ دڵی ئاوارە هات
دوورکەون ئەی ناحەزان خۆ باوی بەدکاری نەما
وا فریشتەی ڕووگەش و شیرین بەرەو ئەم شارە هات
ئەو کەسەر جەرگ و دڵی صەد پارە بۆ پێراو و پار
چەشنی مار جولاَیەوە ئەمساڵ کەناوی پارە هات

***

# هەواڵی دڵ لەکێ پرسم

من ئەو یارە دڵی بردوم هەواڵی دڵ لەکێ پرسم
لەمن تۆراوە ڕوومەت گوڵ شکاتی گوڵ لەکێ پرسم
بەکۆمەڵ بلبل و قومری لە باغا مەستی دڵدارین
قسە و ئاوازی شیرین حسابی چڵ لەکێ پرسم
هەرچی هاوڕازمە وەك من سەراپا مەست و سەرسامن
سکاڵای دڵتەزینی خۆم لە کام عاقڵ لەکێ پرسم
لە گریان و لە ئاهی من گەلێك بێزارە دڵدارم
ئیتر سۆزی دەروونی عاشقی بێدڵ لەکێ پرسم
کەمردن دوا بەشی ژینە ئەبێ بۆچی بترسم من
ئیتر باس و قسەی گۆڕ و مەزار و گڵ لەکێ پرسم
***

## من شیعر ناڵێم

من شیعر ناڵێم کە خەڵقی پێم بفەرمون شاعیرە
یا بڵێن کابرا ئەدیبە یا لەم و لەو چاترە
من شیعر ناڵێم کەوا بخرێتە ڕۆژنامە و گۆڤار
یا بڵێن بۆ ناوە بۆ سامانە یا بۆ خاترە
من شیعر ناڵێم هەتا هەستی دەروون سەوقم نەکا
چونکە زادەی هەستە ئەشعاریش نەسیحری ساحیرە
شیعر و هەڵبەستم نەکردە سەنعەتێکی دائیمی
شیعرەکانم ناو بە ناوە کەم کەمە زۆر نادرە

***

## پێم مەڵێن شاعیر

پێم مەڵێن شاعیر نەوەك خۆم وابزانم شاعیرم
پێم مەڵێن زانا نەوەك باری نەزانی هەڵگرم
پێم مەڵێن ئاغا نەوەك فیزی درۆ پەیدا بکەم
بۆ بڵندی ئاسمان هەر گەردن و سەر هەڵبرم
پێم مەڵێن تۆ زیرەکی ژیری ئەترسم وانەبم
من بەبێ سەرمایە دەستی هاوڵاتم نابڕم
پێم مەڵێن بۆ پارە تۆ بەرگی کەرامەت پارەکە
بەرگی ئازادی مەحاڵە من لەبەرما دادڕم
پێم مەڵێن بۆ ماڵی میر ئامادەبم بۆ نان خوان
ئاوی ڕووی خۆم من بە پەنجەی پیسی زیللەت ناسڕم
پێم مەڵێن قەت ئافەرین نەك بێم بکەومە هەڵ فڕین
بۆ فشە و هاتە و هەوا بۆ عەرشی باڵا ڕێ کرم
***

## لە چەرخی پڕ لە ئازارا

لە چەرخی پڕ لە ئازارا ئەچەرخم چەشنی دوو چەرخە
کەچی ناگاتە دەستم دەستی نەرمی ئەو بەرخە
تەماشای باڵەخانەم کرد و یارم دی کە وەستاوە
خوای گەورە دڵ و ڕۆحم بۆلای ئەو دولبەرە سەرخە
گەلێك پاڕامەوە مەیلم بداتێ هەروەکو جاران
بەڵام پاڕانەوەم گشتی لەلای ئەو یارە کەم نەرخە
گەرەکمە خەڵقی بی زانێ کەتۆ شای نەوجوانانی
دەسا بۆ ڕاستی واتەم کوڵم و دیدە و پەرچەمت دەرخە
***

# ئەی خوایە

ئەی خوایە خۆت ئەزانی کە کردەوەی چاکم نیە
بۆیە وامن قەت لە تانەی ناکەسان باکم نیە
زۆر گوناهبارم بەجۆرێك نایەتە حەد و حیساب
سەیری تۆمار ئەکەم یەك لاپەڕەی پاکم نیە
هەرچی تۆ فەرموتە بیکە من ئەبەد نەمکردووە
دیارە عەبدێکی خراپم هۆش و ئیدراکم نیە
هەر بە وێنەی جانەوەر ڕێگای ژیانم گرتووە
غەیری مەیلی بەزم و بادە عەیش و خۆراکم نیە
دائیما مەست و دەبەنگ و پەست و سست و کەم دەسم
گەرچی وەك هەندە کەسانێك کاری تریاکم نیە
وا لەڕێ دەرچووم کە ئاسۆی ڕەحمەتم لێ ون بووە
بیر و هۆشی گۆڕ و مەرگ و ئەلحەد و خاکم نیە
خوایە بم بەخشە بە ڕەحمی خۆت ئەوسا بشمرم
خۆشە چونکە من ئومێدی ژینی ڕووناکم نیە
***

## خەندەی یار

کەیار بۆ خەندە دەم ئەکاتەوە
شادی لە گیانم جەم ئەکاتەوە
شەرمەزار ئەبن نارنج و لیمۆ
کەدوگمەی بانی مەم ئەکاتەوە
ئەگەر نەیبینم هەر ڕۆژە جارێ
سالێك لە عومرم کەم ئەکاتەوە
کە لێم نەپرسێ لەڕووی نازەوە
دەماوەندی دڵ تەم ئەکاتەوە
وەختێ کە ئەڕوا بەلار و لەنجە
لاسایی پۆڕی چەم ئەکاتەوە
هەروەك مامزی بیابانی چین
کەمن ئەبینێ رەم ئەکاتەوە
کەبێ وەفایی ئەدا نیشانم
دەرگا لە هۆردووی غەم ئەکاتەوە
منیش هاوڕازی وەلی دێوانەم
کاتێ کەباسی شەم ئەکاتەوە
***

## چ نەشمیلەی

چ نەشمیلەی ئەڵێی دەنکی برنجی
بەڕوومەت میسلی شووشەی بێ گرنجی
لە سەرتاپاتەوە عەیبی نەبینی
هەچی کەس دای لە شێوەی تۆ سەرنجی
لە باغی جوانی تۆدا بۆنی خۆش دێ
ئەرێ نارنجی تۆ یاخود ترنجی
ئەکەم داوا بە ئومێدی موداوا
لەلێوت تاقە ماچێ گەر نەڕەنجی
لەوێنەی تۆ نیە حۆری و فریشتەش
لە عالەمدا بە شۆخی تۆی برنجی
***

## بە تۆ چی

ئەوا من خۆش و شادانم بە تۆ چی
خەریکی بەزم و سەیرانم بە تۆ چی
لەباغ و گوڵشەنا سەربەست و مەستم
هەواڵی غەم کە نازانم بە تۆ چی
لەگەڵ مەیدا لەگەڵ نەیدایە کارم
کە دوشمن وا بەگریانم بە تۆ چی
بەمن یاری جوانم ئاشنایە
لەلای دوو ڕۆژە میوانم بە تۆ چی
کەمن ئەستێرەکەی بەختم بڵندە
ژیانم خۆشە بێ ژانم بە تۆ چی
لەدنیادا بەهەشتم پێ دراوە
دیارە ئەهلی ئیمانم بە تۆ چی
لە ناخۆشی لە بێچاری تەریکم
بە شەوقە شوێن و نیشانم بە تۆ چی
بڕۆ ئەی ناحەزی ناکەس بناڵە
تنۆك نایە لە چاوانم بە تۆ چی
قسەی ئەو یارە وەك ئایەت وەهایە
ئیتر بێ باکی پەیمانم بەتۆ چی
نیە کارم بە دکتۆر و بەدەرمان

کەماچی دەم بێ دەرمانم بەتۆ چی
لەلام قانوون شتێکی بێ وجودە
کەمن بێبەش لەتاوانم بە تۆ چی
هەموو دنیا کەهی تۆبێ بە من چی
خەزێنەی عەشقە سامانم بەتۆ چی
***

## بێ موبالات

وەرە با لەژین نەکۆڵینەوە
چۆنی بەوردی نەبێژینەوە
بێ موبالاتی بکەینە ڕابەر
فەلسەفەی ژیری نەخوێنینەوە
تاکو هەمانە نۆشی گیانی کەین
غەمی دواڕۆژ نەچێژینەوە
مەرگ و تەنگانە دەربکەین لەیاد
لەپرسە و ترسی نەپرسینەوە
ئەوەی چوو وا چوو لەدەرد و ئازار
با ڕێسی قرچۆک نەڕێسینەوە
لادەین لەدەرد و ڕەنجی سیاسەت
بەم کارە سەرمان نەپێچینەوە
ئێستا لە دەستتا هەیە دوو سێ ڕۆژ
بەمەستی و شادی بیبڕینەوە
لەناو گوڵشەنا ژین بەسەر بەرین
ئەمڕۆ بەسبەی نەگۆڕینەوە
لەگەڵ نیگارا لەباخی شارا
جێگا بۆ شادی بدۆزینەوە
با ماچی گۆنا مەزەی بادە بێ
بێ ئاو بە سادە بێ نۆشینەوە

بچینه بەزم و ڕەزمی گۆرانی
یا ڕەشبەڵەك و هەڵپەڕینەوە
خەندە بکەینە شیعاری ژیان
بەلای گرژیا قەت نەچینەوە
بۆ خۆشەویستی کۆچکردوو نەگرین
چیرۆکی ناسۆر نەگێڕینەوە
***

## بێ تۆ

ژیانی من لەدوری ژانە بێ تۆ
بەشم هەر حەسرەت و گریانە بێ تۆ
گرانە باری غەمباری لەسەر دڵ
نەمانم زۆر لەلا هەرزانە بێ تۆ
نە خەو ماوە نە خۆراکم هەمیشە
دەرونیشم بەشی سوتانە بێ تۆ
کەساسی بۆتە هاوکاری ژیانم
فەرەحناکی لەسەر فەوتانە بێ تۆ
هەموو ڕۆژێ ئەگەر ڕووی تۆ نەبینم
هەموو دنیام لەلا زیندانە بێ تۆ
***

## مەپرسە

مەپرسە لە حاڵی من مەپرسە
لە کات و ڕۆژ و ساڵی من مەپرسە
مەناسە تاکو ماوی من مەناسە
لە باب و مام و خاڵی من مەپرسە
ئەوا تۆ دیارە زۆر شیرین و شۆخی
لە گیان و ژینی تاڵی من مەپرسە
وەکو دێوانە لات و ڕووت و قوتم
لەبەرگ و خوان و ماڵی من مەپرسە
قسە و باسی وەفا دەرکە لەبیرت
لەیاری چاو کەژاڵی من مەپرسە
وتم با گەوهەریش بێ بەهایە
لە ئاوازە و خەیاڵی من مەپرسە
بە ناکامی بە ناشادی کەبمرم
لە رابوردووی بەتاڵی من مەپرسە
***

## ئەریٚ تاکەی

ئەریٚ تاکەی وەها پەستی ؟
وەها بیٚ تین و کەم هەستی
چی یە بۆچ وا کز و ماتی
کەمەر بۆ شادی نابەستی
بەبیٚ باکی بەناوبانگی
چی یە واپیٚی کە دەربەستی
ئەگەر دوچاری یاریٚك بووی
بەیادی عەشقی وامەستی
ئەگینا تۆ کەئەتناسم
بەویٚنەی ئاوی ناوەستی
بەڵیٚ دڵداریە تەنها
کەوا کەوتویە ژیٚر دەستی
***

## لەسەر چی

لەمن ساڵێکە ڕەنجاوی لەسەر چی
گوناهم چی بوو تۆراوی لەسەر چی
گوڵی گوڵزاری شادی بووی هەمیشە
لەبەرچی بۆچی ژاکاوی لەسەرچی
وەکو جاران کەمن دڵسۆزی تۆبم
بەرابەر من کەگۆڕاوی لەسەر چی
سەر و ڕۆحم چیە پێشکەش بەتۆبێ
بەسە ئیتر پەشۆکاوی لەسەر چی
بەهاری ژین بەرەو پیری ئەتۆ دێ
ئیتر کەم تین و بێتاوی لەسەر چی
***

## شکانم تۆبە

ئەگەرچی چوومە ریزی تۆبە کاران
فەرامۆش ناکرێ بۆم عەشقی یاران
بەرامبەر یار و بادە کەم ئیرادەم
وەلێ ڕۆژانی زۆر خۆشی بەهاران
شکاندم سەد کەرەت تۆبە لە تۆبە
هەمیشە چوومە ریزی هەرزەکاران
لەگەڵ نەیدا لەگەڵ مەیدا خەریکم
ئەکێشم رەنج و نازی نەو نیگاران
دەسا ئەی یارەکەی شیرین و شۆخم
بدە مەیلت بەمن وەك جاری جاران
هەمیسان تۆ لەدینت وەرگەڕانم
لەڕێتا چاوەڕوانم وەك هەژاران
***

## تاكەی

بمێنم بەم غەم و ئازارە تاكەی
بژیم سەرسام و پەتیارە تاكەی
وەكو مەجنونەكەی دەشت و بیابان
ئیشارەم لێبكەن لەم شارە تاكەی
ئەوا وەختە دڵم دەرچێ لەسینەم
نەنۆشم عارەقی دووبارە تاكەی
كەسان و ناكەسان لەویارە شادن
بەشم ناشادیە لەم یارە تاكەی
ئەرێ ئەی چارەسازانی خواناس
ئەكەن چارێكی ئەم بێ چارە تاكەی
***

## ڕەنجی دڵداری

خۆم بەقوربانی کەسێك ناکەم کەوا
ڕەنجی دڵداریم بداتە دەم هەوا
یا بەچاوی سوکەوە سەیرم بکا
وەك هەژارێکی کەساس و بێ نەوا
خوا ئەزانێ خۆی ئەزانێ وا کەمن
چیم دی چیم نۆشی لەپێناوی ئەوا
ئەو کەچی ناپرسێ چۆنی چۆن ئەژی
تا سلاوێکیش بەمن ناکا ڕەوا
نەرمی لەو دڵبەردە چۆن ئەکرێ ئومێد
ڕۆژ چلۆن هەڵدێ لەتاریکی شەوا

***

## بەخێربێ پۆستەچی

بەخێربێ پۆستەچی یاخوا بەخێر بێ
ئەڵێن نامەی نیگاری پێ یە خێر بێ
ئەڵێن هێناویە خۆشی و بەشارەت
دەبا ناحەز لەداخا چاوی کوێر بێ
ئەوەی مژدەی فەرەح بۆ من ئەهێنێ
خودا هەر دڵ فەرەح بێ ساغ و تێر بێ
ئەوەی وەك بایەقوش شومی دەخوێنێ
دز و ناحەز بە حاڵ و ماڵی فێر بێ
ئەوەی وا توخمی ناپاکی دەچێنێ
ژیانی هەر زیان بێ هەر لەژێر بێ
لەلام شیرینە نامەی یاری شیرین
ئەگەر چی پڕ لە تانەی تاڵ و سوێر بێ
***

## ئەگەر سوچم هەیە

ئەگەر سوچم هەیە خوێنم بڕێژە
لەناو باغی گوڵا گیانم بنێژە
ئەگەر پاك و هەژار و بێ گوناهم
شەرابی کامەرانیم پێ بچێژە
لەبێژنگی ژیان گێژ دراوم
درشت و هەرزە بێژم پێ مەبێژە
لەسەر کێوی ئەمەل ئاوارە ماوم
ئەبینم ڕێڕەوم زۆر سەخت و لێژە
لەداخی دەرد و ئازاری هەژاری
ئەوەی من نامەوێ عومری درێژە
***

# دیده مەستان

کەتیٚ پەڕکەن بەلاما دیده مەستان
شتێکی دور نیه دڵ ببێتە وەستان
لەناو گەرمی کڵپەی ئاگری عەشق
نیه باکم لەبەفر و ساردی زستان
وەرن یارانی مەیدانی موحیببەت
مەدەن تانه لەجۆشی بت پەرستان
کەیار تەشریفی هێنا رۆژی هەینی
لەگۆڕستان بەجاریٚ مردوو هەستان
کەسان و ناکەسان دوربن لەمن سا
نەسوتێن با بەئاهی ئێوه کەستان
***

## ژیانم جیلۆ دەرکە

وەرە گیانم ژیانم جیلۆ دەرکە
بەشادی غەم لە گۆشەی دڵ بەدەرکە
دەمێکە تۆ لەمن دووری بەقوربان
سەرێکم لێ بدە تۆ من بەسەرکە
گەلێ شیعرم هەیە بۆتۆی ئەخوێنم
شتێکی جوانە هەندێکی لەبەرکە
بەبێ تۆ ئێمە لەم شارە هەژارین
بەسە بەس هێندە تۆ مەیلی سەفەرکە
کە تاوانت لەمن دی لێم بڕەنجە
بناغەی ژینەکەم ژێرە و زەبەرکە

***

## ماچێ

نەبەخشی گەر بەمن لەو لێوە ماچێ
ئەترسم رەنجی دڵداریم بەباچێ
بەتەنها عەشقی تۆ جێ گیری دڵمە
بەدڵما جوانی ئەم دنیایە ناچێ
ئەکەومە دۆزەخی دەرد و بەڵاوە
لەبەرچاوم کە ئەو ڕوخسارە لاچێ
بە نینۆك هەڵکەنم من گۆڕ لەبۆ خۆم
نیە کارم بەبوونی بێڵ و پاچێ
ئەوەی وا تۆ کەدڵگیرکا لە ئێمە
هەموو گیانی بەکوورەی ئاگراچێ
***

## هەواڵی تۆ

هەواڵی تۆ هەموو دەم گەر نەپرسم
لەتانە و تیری نامەردان ئەترسم
کە ئەتبینم هەموو گیانم ئەلەرزێ
فەرامۆشی ئەکەم ئەشعار و دەرسم
لەڕێگەی ماڵی ئێوە ناحەزم دی
بەوێنەی جاشی ماندوو کەوتە سەرسم
فیداتبم من لە زومرەی عاشقانا
مرۆڤێکی بەنرخ و بەرز و قورسم
وەڵامی مەسئەلەی رازی موحیبەت
بەتەنها هەر لە زاتی تۆ ئەپرسم
***

# ئەفەرمووی پێم

ئەفەرمووی پێم کە واز بێنم لە بادە
بژیم وەك جانەوەر ژینێکی سادە
لەلام ئەم کارە زۆر سەخت و گرانە
ژیانی من بەمەستی خۆش و شادە
بفەرمووی بمرە لام ئاسانە ئەمرم
نەوەك فەرمووی لەیار و بادە لادە
مەدە تانە لەمەی خۆرانی سەرمەست
ئەگەر پەندی خەیامت تۆ لەیادە
کەوا فەرموویە مەی شوعلەی ژیانە
بلێسە و رابەری ئاوات و دادە..
وەکو من تۆش کە غەم داوێنی گرتی
بەبادەی سادە عومری غەم بەبادە

***

## ئەگەر زانیوتە

ئەگەر زانیوتە باسی من
پەرێشانی و کەساسی من
دەرونی گەرم و سوتاوم
دلّی پەست و هەراسی من
چلۆن لەم گیانە بێزارم
پەشۆکاوە حەواسی من
بەتالاّن چوو سەر و مالّ و
نقود و ئەسکەناسی من
کەحالّی بووی بە رووناکی
لەکاسەی مەغزی کاسی من
لەشێوەی شومی شێواوم
لەبەرگی وەك پەلاّسی من
دلّی نەرمت ئەسوتی زوو
بەژینی بێ ئاساسی من
ئەپرسی دادی من ئەکرێ
لەدەرد و غەم خەلاسی من
***

# بده ڕێگەم

بده ڕێگەم پەری شێوە
بگاتە دەستم ئەو سێوە
بەنەرمی بیگوشم نەختێ
ئەگەر دڵگیر نەبن ئێوە
وەیا بیبەخشە زۆر خێرە
بەمن ماچێکی ئەو لێوە
لەگەڵ ئەو ماچە پێم خۆشە
کە ڕۆحیش دەربچێ پێوە
لەڕێتا خاکی بەرپێتم
مەڕۆ ئیتر لەبێ ڕێوە
***

## بەرێکەوت

ئەگەر رێت کەوتە یانەی من بەرێکەوت
ئەڵێم ئۆخەی کەدێوی نەگبەتی خەوت
لەدڵما زۆرە هۆی رەنجی هەژاری
کە تێپەر بوون لە ئەعدادی شەش و حەوت
لەبەر تیر و توانجی خزم و خەڵقی
لە دینداری نیە گەر بچمە مزگەوت
لەژین بێزارە دیارە پڕ جەخارە
ئەوەی بەردا لە گیانی ئاگر و نەوت
ئەوانەی تێ ئەکۆشن بۆ خراپە
خوای عالەم بیانکا زوو بە زوو فەوت
لە ئازار و لە بێزاری ژیاندا
دڵم خۆزگە سەعات و کاتێ ئەسرەوت
سەرم لێ تێکچووە کاس و هەراسم
لەبیرم چۆتەوە تارۆین و ڕەوت
لەبەر نالەی تریشقە و بەرقی میحنەت
بەوێنەی جانەوەر رووم کردە ئەشکەوت
***

# دڵم شکاوە

دڵم شکاوە دڵم شکاوە
دڵم بە دەستی گوڵم شکاوە
ئەمبینیٚ کەوا لات و لاوازم
لەباغی ژینا چڵم شکاوە

---

لەتیری تانەی ناکەس هەراسم
بۆیە هەمیشە دەبەنگ و کاسم
چاوم هەر شێوەی نیگار ئەبینیٚ
هەر ئەو غایەمە هەر ئەو ئەناسم

---

ئەمەویٚ دڵی شکاوم بەمەی
یا بە ئاوازی دڵرفێنی نەی
بکەم سارێژ و لەبیر بەرمەوە
جەوری زەمان و ئاهو پەژارەی

---

بەڵام هیواکەم ئەڕوا بە هەوا
هەروەکو ئاهی هەتیو لەشەوا
هەروا ئەمێنم بەم ژینە پەستە
بیٚ هۆش بیٚ ئومێد بیٚ کەس بیٚ نەوا

***

## دڵی من بوو

لە رابردوویەکی دوورا
کەدنیا مات و هێمن بوو
لەسەرما لەناو ژوورا
ئەوەی جولاّدڵی من بوو
کە هەوری ڕەش بروسکەی دا
لە ئاسمانی تەماویدا
دڵی من کەوتە سەر خولیا
لە چوار چێوەی شکاویدا
لەکاتی پایزی ژینا
کە ئەمڕۆیە وەکو جاران
دڵم ماوە لەیەك تینا
نیە باکم لە باو باران
***

# ئەی عەلی مەردان

ئەی عەلی مەردان ئەی عەلی مەردان
ئەی پیری دەنگ خۆش ئەی مەردی مەردان
ئەی جولێنەری هەست و هۆش و گیان
ئەی بە بادەری غەمانی ژیان
وا سوێندت ئەدەم من بە کوردستان
بە گیانی پاك و خوێنی شەهیدان
بە چاوی مەست و کیژۆڵەی کوێستان
بەڕەنگی ئاڵ و گوڵاڵەی کەژان
بەبای نەسیمی خۆشی بەربەیان
هەم بە جریوەی مەلی گوڵستان
توخوا قەتارێك بڵێ زۆر بە جۆش
با پەستی دڵان بکەین فەرامۆش
بەجۆرێك چیا بێنێتە لەرزە
بێنێتە خرۆش ئەهلی ئەم ئەرزە
تا ببێ سارێژ دەروونی زامار
تەفر و تونا بێ هورژومی ئازار
***

## ئەوەی فەرمووی

ئەوەی فەرمووی بەمن تۆ مەی مەنۆشە
شتێکی سەیرە خۆشی بادە نۆشە
ئەوەی ئەیوت برا هەر چاکە چاکە
لەبەر ناچاکی خەڵکی لێی بەجۆشە
ئەوەی ڕێگای خواناسی نیشاندام
ئەڵێن خۆی مەست و پەست و شەر فرۆشە
ئەوەی پەندی ئەدا بۆ تەندروستی
ئەڵێن خۆی زار و زامار و نەخۆشە
ئەوەی وا ڕابەری عیلم و ئەدەب بوو
لەرێ لایداوە زۆر بێ هۆش و گۆشە
ئەوەی وەعزی ئەدا بۆ پاکی داوێن
ئەڵێن هەر شەو قەپاتمەی وا لەکۆشە
ئەوەی خۆی تەمبەڵ و بێ ئیش و کارە
ئەڵێ پێم تاکو ماوی تێبکۆشە
ئەوەی میللەت پەرستی کردەوەی بوو
خەریکی (ریستو سێ ئاس و فلۆشە)
ئەوەی ناوبانگی دەرچوو بوو بەژیری
بە گاوانی ئەوت گام بۆ بدۆشە
ئەوەی تاوانی زیاتر بوو لە شەیتان
بە مام شێخی ئەوت سرم بپۆشە
ئیتر چۆن باوەڕم بێ من بە ئینسان
کەوابوو چاك و پاکی کەم پەرۆشە
***

# دڵ

هەندێ کەس ئەڵێن دڵم شکاوە
هەندێکیش ئەڵێن دڵم سووتاوە
ئەمە سەراپا قسەی بەلاشە
دڵ زۆر بەتین و بەهێز و باشە
دەرهەق دڵ ئەمە گوناهو خەتان
کە دڵ ناو ئەبەن بەم جۆرە کەسان
دڵ وا بەهێزە چەشنی پۆڵایە
عەرشی بڵندی عەشقی لەیلایە
دڵ فەرمانڕەوای ئەندامی گیانە
کان و مەڵبەندی خۆشی ژیانە

***

## لەو زوبانی هەژارێکەوە

### ((بەمن چی))

کەمن هیچم نەبێ گەوهەر بەمن چی
دوڕ و یاقوت و سیم و زەڕ بەمن چی
کەمن دەستم نەگاتە پاروە نانێك
کەبابی چەوری گۆشتی مەڕ بەمن چی
کەمن بەرگم پەلاس و چیتی شڕ بێ
قوماشی باشی (مانجستەر) بەمن چی
کەمن بێ حاڵ و ماڵ و لانەوازم
تەلار و کۆشکی شێخ حەیدەر بەمن چی
کەمن چاوم نەبێ دنیا ببینم
شوعاعی مانگ وەیا ئەختەر بەمن چی
کەمن بێبەش لەشیرینی ژیان بم
درەختی بەرزی خاوەن بەر بەمن چی
کەمن گیانم لەدەنگی مەل بلەرزێ
نەڕەی پڕ سامی شێری نەڕ بەمن چی
کەمن داماوی گێژاوی بەلا بم

بزەی لێوی پەری پەیکەر بەمن چی
کە هۆش و بیر و ژیری تیا نەمابێ
بەکەڵکی چی دێ کاسەی سەر بەمن چی
کە ئەم گەردوونە کارخانەی ریابێ
قسەی شیرین و خۆش و تەڕ بەمن چی
کەمن بمرم وەیا نەمرم بەتۆ چی
کەتۆش مابی و نەمابی هەر بەمن چی
***

## ئێستا

له دەستا گەر هەیە دوو عانە ئێستا
برۆ خەرجی بکە ئازانە ئێستا
نەکەی تۆ بۆ سبەینیٚ پارە جەم کەی
ژیانی خۆشی زۆر هەرزانە ئێستا
لەگیرفانا نەکەی حەبسی دراوت
بچۆ لوقەنتە یا مەیخانە ئێستا
بکە تەعمیری مێشك یا مەعیدەت
فەرەح بۆتۆ گەلێك ئاسانە ئێستا
سبەینیٚ خوٚا ئەزانیٚ چیت بەسەردیٚ
بە پارە ژینی تۆ شادانە ئێستا
ئەوانەی دەستیان قوچابوو مردن
لە دۆزەخ موچەیان سووتانە ئێستا
لە دنیاش ناویان نابریٚ بەچاکە
جنێو بۆ گۆڕیان ملیانە ئێستا
مەکە بیری پەرێشانی سبەینیٚ
هەتا ژین رووگەش و خەندانە ئێستا
کەتێر و پۆشتەکەی ماڵ و منالٚت
دڵت خۆش و سەرت بیٚ ژانە ئێستا
بەجیٚ بێنە براکەم پەندەکەی من
سبەی بۆ مردنە و بۆ مانە ئێستا

***

# ئەمشەو

کەیارم دی دڵم زۆر شادە ئەمشەو
لە بەندی غەم دەروون ئازادە ئەمشەو
بەلێوی پڕ لە خەندی حاڵی پرسیم
ئەگەر چی پێی نەداوم وادەی ئەمشەو
لەباغی شادیا پەروازە کارم
کەلاوەی بومی غەم بەربادە ئەمشەو
ئومێدم وایە ژین بێ دەرد و شین بێ
دوعام لای غەوسەکەی بەغدادە ئەمشەو
***

# ئێوە کێن

ئێوە کێن ئەی روو گوڵینە ئێوە کێن
تو خودای عاشق و موحیببەت پێم بڵێن
ئێوە کێن بێباك و مەغرورن کەوا
زۆر بە ئازایی بەرەو ئەم شارە دێن
ئێوەکوردن یا مەجوسن یا مەغۆل
پەنجەتان سوور کردووە هەردەی بەخوێن
تێپەڕین و هیچ نەتانپرسی لەمن
هیچ نەتان فەرموو کەوا چین و لەکوێن
ناز و راز و دەنگ و رەنگی ئێوەیە
وا ئەلەرزێنیٚ دڵی باز و شەهێن
من دڵم چۆن ئەسرەویٚ بەم زامەوە
چۆن بدەم بەم ڕۆحە بۆ شادی بەڵێن
***

# وەرن

وەرن ئەمڕۆ بەهارە مەی بنۆشین
بەجارێ بەرگی دڵشادی بپۆشین
وەرن دەرچن لەشار و روو بکەینە
دەر و دەشت ولەخۆشیدا بجۆشین
وەرن دوربین لە ئازار و لە بێزار
لە بەزم و رەزم و سەیرا تێ بکۆشین
ئەما ترسی براکوشتن لە شارا
ئەبێ ئیتر پیاڵەی غەم نەنۆشین
لەکەس غەم ناکرین بەم رۆژە خۆشە
بەیارانیش غەم و هەم نافرۆشین
کە نازدارانی گوڵشەن جیلوە دەربن
بەگیان و دڵ سەراپا ئێمە خۆشین
گەرەکمانە هەموو کەس دڵ فەرەح بێ
هەموو خاوەن شیعر و بیر و هۆشین
***

## هاتووی

بەڵێن وابوو بەرەو ئەم یانە هاتووی
بکەم بڕوا کەهاتووی یان نەهاتووی
بەخێر هاتی فیدات بێ ڕۆح و گیانم
دیارە بۆ سەر ئەم چاوانە هاتووی
لە پەروازایە گیانم زۆر بەخۆشی
چرای بۆلای منی پەروانە هاتووی
لە بازاڕی نەمانی ڕێز و نرخا
بەوێنەی گەوهەری یەکدا نەهاتووی
ئەرێ ئەیدڵ ئەتۆش وەك بولبولی زار
بەناڵەی زارەوە بۆلای نەهاتووی
سەرم سوڕما لە کەم هۆشی تۆ ئەی دڵ
لەگەڵ غەمدا ئەرێ بۆچ ڕانەهاتووی
***

## وا مەزانن

وا مەزانن پیرە شەیتان نوستووە
رۆڵەکانی پێش کاروان ٚخستووە
خۆ فریشتەی چاکە نەیماوە نەشات
دەستی خۆی بۆ کاری چاکە بەستووە
ئێستە کاڵای باش چلۆن دەسگیر دەبێ
دەستی ناپاکی  کە ریسی رستووە
ئێستە فەرزە رێزی بگرێت بێ گومان
ئەو کەسەی جاران کە کەس نەی ویستووە
ئەمڕۆ سەرکار و لەمەیدان غار ئەدا
جۆرە ئینسانێك کەتۆ هەر نەت بیستووە
***

## شۆخان

شۆخان لەباخا با جوان و گەش بن
لە دڕك و داڵی ژیان بێ بەش بن
با بەختیاری و خۆشی بەشیان بێ
دوور لە ئاوازی بوومی ڕوو ڕەش بن
خوایە دڵداران یارانی هاودەم
لە نەردی ژیان خاوەن دوو شەش بن
ئەوانەی شۆخان دڵ ئازار دەدەن
دوچاری دەرد و ئازاری لەش بن
جوانانی وڵات گەرچی کەم وەفان
با هەر زیادبن هەریەك بە دەش بن
***

# له خوا ئەخوازم

ئەگەرچی ئەو یارە من بەسەر نەکا
غەمی چەند ساڵەم لەدڵ دەرنەکا
له خوا ئەخوازم ئەویش وەکو من
بەرگی دڵشادی قەت لەبیر نەکا
گەر بەلای منا لانەکاتەوە
گیانی له ئازار بێ ئەسەر نەکا
له تەندروستی ئەویش بێ بەش بێ
له چاوەی خۆشی لێوی تەڕ نەکا
نانا ئەی خوا هیچ دەرد و رەنجێ
دڵدارەکەی من موکه دەر نەکا
من گیان و رۆحم بێت بەقوربانی
هەرچەندە منیش کەبەسەر نەکا

***

## کوانێ دڵسۆزی

کوانێ دڵسۆزی لەناو وولاّتا
یا لەناو شارا یا لە دێهاتا
حاڵی زاری من کەوا بپرسێ
لە هەر زەمان و کات و سەعاتا
کوانێ هاودەمی دۆستی هاوڕازێ
لە ڕۆژی خەم و دەرد و ئافاتا
کوا چارەسازێ بۆ داخی دەروون
لە گەرمە و تینی داد و شکاتا
کەس دیار نیە مەگەر لە حاڵی
دەعوەت و شادی و دیاری و خەلاّتا
هیچ کەس نەیماوە پیشەی دڵسۆزی
بۆغایە نەبێت لە کائیناتا
***

## مەی ئەخۆمەوە

من هەتا ماوم مەی ئەخۆمەوە
زوخاوی دڵی پێ ئەشۆمەوە
گەر نەهاتیم دی لەڕێی ژیانا
بۆ یانەی نەمان زوو ئەڕۆمەوە
هەرچەند لاواز و مات و بێ تینم
گیانم گرانە بەدەست لۆمەوە
وەکو خنکاوی زیندانی میری
نووزە دەرنایەت لە گەروومەوە
تروسکەی ئومێد دیارنیە بۆمن
لە ئاسمان و لە ئاسۆمەوە
***

## جوانی تۆ

جوانی تۆ دڵدارەکەم بێ وێنەیە
کوڵم و چاوت هەروەکو ئاوێنەیە
تۆ لەهەرلایەك نەبی وەك دۆزەخە
بێیتە هەرلایەك بەهەشت ئەو شوێنەیە
گیانەکەم هاوڕازەکەت زۆر کافرە
کوشتنی ئێمەی لەلا دروێنەیە
خۆی نیە تەنها قەلاَچۆمان ئەکا
زۆرە ناحەز دوژمنی ئەم خوێنەیە
یاری من بەخشینی هیچ پیشەی نیە
وەك مەلا (های) لانیە هەر بێنەیە
***

## ئەڵێن خنکاوە

ئەڵێن خنکاوە ساوا لە ئاوا
باڵی شکاوە قومری لەداوا
کلکی پەڕیوە ڕێوی لە ڕاوا
ناوی نەماوە پاشا لە ناوا
ئەمانە هەموو سوك و ئاسانە
لەچاو وەفاتی پیری مەیخانە
دەنگی کزبووە لۆتی زوڕناکەی
جێی هیوا نیە ساز و هەواکەی
موتریب کەمجۆشە بەزم و نەواکەی
تیا ترۆ نەما جوانی سەماکەی
چونکە مەیخانە قاپی داخرا
زەمزەمەی شادی هەموو لاخرا
***

## تەمای دوو ماچ

تەمای دوو ماچی دوو چاوی بەڵەکمە
لە ئەو یارە کە هاوماڵی گەڕەکمە
وتی یا ساغە ماچی من وتم من
گەرەکمە رۆحەکەم بەخوا گەرەکمە
وتی لاچۆ هەتیوە بێ حەیایە
کەس و کار و برا گشتی لەتەکمە
وتم بۆچی رەقیب هەر وەك سەگ لەدووتە
وتی کۆیلەی وەفای نان و نمەکمە
وتم لەم چەرخە کێ سەرداری تۆیە
وتی یەزدانە تاقانە سەرەکمە
وتم بیرت هەیە وادەت بەمن دا
وتی کەی بیری ساڵێ شەست و یەکمە
وتم ئەمڕۆ زەماوەندە لەگوڵشەن
وتی زۆر مەیلی چۆپی و ڕەشبەڵەکمە
وتم لایەق بەتۆیە خشڵی ئەڵماس
وتی بۆ گەردن و پەنجە ومەچەکمە
وتم ئاخۆ بەچی پێکابێ دڵی من
وتی برژانگ و ئەبرۆ و تیر وچەکمە
وتم رەحمێك بەحاڵی منکە فەرمووی
ئومێدی وەرگەڕانێکی فەلەکمە
وتم رۆیم بە مەئیوسی لەلاتان
وتی بۆ تۆ دوعای (الله معك) مە

***

# دڵی یار

دڵێ ئەو یارە خوایە زوو نەرم بێ
لەڕێی دڵداریا هەستێ گەرم بێ
بەلاما تێپەڕی حاڵم بپرسێ
سەری خۆی دانەپۆشی بێ شەرم بێ
لەڕازی ئەم دەروونەم پێ بزانێ
دڵم پێداوە دۆست و دولبەرم بێ
لەمەیدانی نەبەردی عەشق و ژینا
گەرەکمە ئەو نیگارە رابەرم بێ
ئەگەر بێ ببمە شای ئەم سەر زەمینە
ئەبێ ئەو یارە هەر تاجی سەرم بێ
***

## بۆم بێنە بادە

بۆم بێنە بادە بێ مەزە و بێ ئاو
لەبۆ ساڕێژی دڵەکەی شکاو
سا یەك لە دووی یەك بۆم پڕکە پەرداخ
تا دەرئەکەوێ لە ئاسۆ هەتاو
چل قاپی سەرمۆر وا لەبەر دەستا
دەستت ئەلەرزێ تا ئەبێ تەواو
بەڵکو ئەو خەمەی کەوا لەدڵما
تەفر و تونا بێ بەمەی شەو لەناو
گەر بەمەی نەبێ کەی ساڕێژ ئەبێ
جێگا برینی غەمی دوابڕاو
ئەی ساقی دڵسۆز ئەی پیری بەڕێز
وا بۆت ئەنێرم دوو هەزار سڵاو
پێشکەشت ئەکەم هەرچی ئەفەرمووی
لە پارە و ماڵ و لەزێر و دراو
هەستە مەردانە هیچ رامەوەستە
گوێ مەدە صۆفی خەرقە هەڵوەشاو
با ئەو هەربڵێ بادە حەرامە
تۆ هەر بۆم تێکەبێ حەد و حیساو
هەتا ئەکەومە خۆشی و هەوای خۆم
ئەبمە فرۆکەی خەیاڵاتی خاو
ئەچمە بەهەشتی بەزم و دڵشادی
چیای تەمناکم ون ئەبێ لە چاو
***

## شکاوە

چرای روناکی دڵشادیم شکاوە
چرۆی گوڵزاری ئازادیم شکاوە
هیوای دڵداری ژینم لەدەست چوو
کە نێشەی تیژی فەرهادیم شکاوە
تکام ناگاتە لای سەرداری شۆخان
ئومێدی داد و بێدادیم شکاوە
لەیادم دەرنەچوو مەیلت بەقوربان
تەنووری گەرمی کەم یادیم شکاوە
لەبەر ئازاری گیان و ژانی ژینم
خەیاڵی خاڵی بیجادیم شکاوە
نەما ئاواتی ژینی کامەرانی
سوراحی بادەکەی نادیم شکاوە
***

# سەد ئاخ

له فیتنەی چاوی  مەستی ئێوە سەد ئاخ
له زوڵم و زۆری دەستی ئێوە سەد ئاخ
له بێباکیت بەرامبەر ئێمە سەد غەم
لەبەر کەم تینی هەستی ئێوە  سەد ئاخ
له هاوڕازیت لەگەڵ ناکەس دوو سەد ئۆف
له پیشەی خۆ پەرستی ئێوە سەد ئاخ
چییه ئامانجی ئێوە بۆ نەمانم
له مەجهولی مەبەستی ئێوە سەد ئاخ
بەوادەی سادەتان بڕوا نەماوە
له وادەی نادروستی ئێوە سەد ئاخ
به چاوی سوکی سەیری ئێمەتان کرد
له عەتفی پەست و سستی ئێوە سەد ئاخ
***

# خەریك ماوم

لە مەیدانی ژیانی تاڵ و تارا
خەریك ماوم تەریك ماوم لە ئارا
گەڵێ زارم لەژین بێزارە گیانم
پەژارەم وام لەناو دەریای جەخارا
هەراسانم لە جەوری خوا نەناسان
پەرێشانم لەدەستی شێت و هارا
ئەگەرچی بێگوناهو زۆر کەساسم
لەلام زۆر باشە گەر بمکەن بەدارا
ئەوەی یارم بۆ ئێستا لێم بەقینە
لەگەڵ کەسدا نەما بۆمن مودارا
لە بەدبەختانی دنیا من سەرۆکم
نیە جێگەم لە زومرەی بەختیارا
هیوای روناکی نابینم لە ئاسۆ
ئەژیم دایم لەگۆشەی تار و مارا
ئەوەی ئەمساڵە بێ چاری کەمن دیم
هەزار خۆزگەم بەحاڵی ساڵی پارا
کەسان شادن لەگوڵزار و چەمەندا
منیش کەوتووم لە غەمخانەی هەژارا

***

## ئەوا هاتوومەلات

ئەوا هاتوومەلات گەرچی دەرم کەی
وەیا خۆنیمە نیمەی خەنجەرم کەی
ئومێدم زۆرە یەزدان بێتە بیرت
کەوا نەختێ دڵێ بەردت نەرم کەی
گەلێك دادم هەیە ئەی پرسی بێ شك
ئەگەر هەندێ لەخوای عالەم شەرم کەی
گوناهم نەبووە دەرهەق زاتی ئێوە
ئەبێ سەیری حیساب و دەفتەرم کەی
چییە ئەگەر تۆ سەعاتێك بێ یتە یانەم
دڵی سادەم بەسەردانێ گەرم کەی
بەدەستی تۆیە من مان و نەمانم
هیوام زۆرە کە لوتفت رابەرم کەی

***

## یاری ئاشنا

هەتا ئەو یارە پێمان ئاشنا بوو
شەوان لامان وەکو رۆژ ئاشنا بوو
کە دەرکەوتایە رووی شیرین و جوانی
لەشەودا شەوقی وێنەی چل چرا بوو
بەخەندەی لێوی شیرین تێی گەیاندم
دڵی نەرمی لەمن نەختێ شکا بوو
بەڵام لێم بوردوە تاوانی بەخشیم
بەسەر چوو قین و کینەی هەرچی مابوو
ئومێدم وایە ئیتر بێتە یانەم
بەرابەر من کە ئێستە هەستی چا بوو
هەژاری سێبەری شومی کەلاچوو
هەتاوی شادی بۆ دڵ ئاشکرابوو
کەمادام هاتە دی ئاواتی ژینم
ئیتر بێ چاری دووچاری فەنا بوو
***

## لەناو باخا

لەناو باخا گەڕام بۆ خونچە لێوێ
کەچی دەستم گەیشتە جوتە سێوێ
گوشیمن زۆر بە خۆشی زۆر بە نەرمی
وتم روو گوڵ سەری باڵی نەشێوێ
کەلێوم بردە سەر کوڵمی نەڕەنجا
بزەی لێوی هەیە خۆی نابزێوێ
بە لوتفی خۆی کەیارم مەیلی پێدام
ئیتر دوورم لەهەر تانە و جنێوێ
ئومێدم وەسڵی یارم بێ لەدڵما
دەرونم بەرهەمی شادی ئەپێوێ
کە شادان بم نیە کۆسپێ لەڕێما
لەلام وەك دەشتە من هەر شاخ و کێوێ
***

# ئەگەر خوا کردی

ئەگەر خوا کردی یار بێتە یانەم
لەچاوا ئەڕوا تاریکی و تانەم
کە یەزدان کردی منی خوێندەوە
ڕوومەت و چاوی خۆی دا نیشانەم
ئەکەومە باخی بەهەشتی شادی
خۆش و گەش ئەبێ من ئەم ژیانەم
گەر بەلای منا لابکاتەوە
زوو چارە ئەکا ئەم دەرد و ژانەم
ئومێدم هەیە خۆش بەسەر بەرم
دوا ڕۆژانی ئەم ژین و مانەم
***

## گوڵ مەشکێنە

ئەگەر چویتە ناو باخ گوڵ مەشکێنەوە
گوڵی هەڵوەریوو مەپلیشێنەوە
هێواش لەسەرخۆ بڕۆ بە باخا
شێوەی جوانی چڵ مەشێوێنەوە
هەڵی مەفڕێنە بولبولی هەژار
دڵی لە ئاواز مەتۆرێنەوە
گوڵانی شیرین بادڵگیر نەبن
یەخەت بە خونچە مەڕازێنەوە
پەڕەی گوڵ گەڵ نەرم و ناسکن
بە دەست و پەنجەت مەیژاکێنەوە
بە نەرم و هێواش گۆرانی بڵێ
وەك برا مردوو مەلاوێنەوە
پێویستە ڕێزی بگریت باخەوان
بە فەرمانی ئەو بجووڵێنەوە
دانیشە لەژێر درەختی سێوا
دڵت بە بادە دامرکێنەوە
شەربەتی شادی نۆشی گیانت کە
ناوی هەری غەم قەت مەهێنەوە
سەرت گێژ مەکە بەپەنگی خەیاڵ
دەردی رابوردوو مەبوژێنەوە
***

# سینەما

که مەیلت نەما لەگەڵ سینەما
خەفەت کۆچی کرد لەناو سینەما
که تۆ ئەچویته ئەو جۆره شوێنه
بووبوو به ژانێك وا لەم ژینەما
سوپاس بۆ خوا رزگاری کردی
هەوای نەفامی هیچ هیوای نەما
ئێستاکه بویته رابەری چاکه
ناسۆرێك نەما لەم برینەما
تۆ بۆم بمێنی بەکامەرانی
ئیتر پەشمە لام چی ماچی نەما
***

## لەڕووتا

ئەوەی بەدکاری نیشاندا لەڕووتا
کەچی وەك سەگ هەمودەم دێ بەدووتا
کەسێ ناپاکی بنوێنێ لەگەڵ تۆ
بەبەرقی ئاسمان خۆزگە ئەسووتا
گەشی و خۆشی لە کولْم و لێوی تۆدان
ڕەشی بەختم ئەبینم وا لەمووتا..
بە وێنەی تۆ نیە یار و نیگارێ
نیە چەوتی لە ڕەفتار و لە خووتا
لە ئێمە نیتە ڕەخنە بێگومانم
کە سەرمان وا لەڕێگەی ئارەزووتا
***

# به تۆ

تاجی جوانی بەخشرا بەتۆ
تەختی شای شۆخان وادرا بەتۆ
تروسکەی ئومێد کە کوژا بۆوە
چل چرای شادی هەڵکرا بەتۆ
ئێستا والآیە رێبازی ژیان
کەقاپی نەگبەت داخرا بەتۆ
قەڵەمی قودرەت مەگەر بینوسیٚ
ئەو راز و باسەی نووسرا بەتۆ
باری غەم کەوا گران بوو بە دڵ
بەدەستی رەحمەت لابرا بەتۆ
لانەی بایەقوش لەناو گوڵشەنا
کەس پێی نەوێرا بەسترا بەتۆ
رازی پەنهانی دڵ و دڵداری
وا گشتی کرا ئاشکرا بەتۆ
دروشمی ئالآی بەرزی دڵداری
بەدەستی هیمەت هەڵکرا بەتۆ
لەناو عالەمی زۆر و ستەمدا
تاجی سەربەستی سەندرا بەتۆ

***

## ئەرای چی

ئەدای چی مات و دڵتەنگی ئەرای چی ؟
لەتەك من مائیلی جەنگی ئەرای چی ؟
ئەوا هاتومە یانەت بوومە کۆیلەت
کەچی بێڕەحم و دڵ سەنگی ئەرای چی ؟
جوانان ڕوو گەش و خۆش و بەعیشوەن
بەڵام تۆ شۆخێکی مەنگی ئەرای چی ؟
وتەی ناکەس دڵی ڕەنجانی ئاخۆ ؟
ئەگینا مات و بێدەنگی ئەرای چی ؟
بتی دنیای جوانی هەر ئەتۆی بەس
لە فەرمانداری بێدەنگی ئەرای چی ؟
***

# تکام لیٚ کردی

تکام لیٚ کردی بم بەخشی لە تاوان
وەڵامت دامەوە فەرمووت بە چاوان
کەچاك بوو تیٚ گەیشتی من گوناهم
نیە لاکین هەمە چاکەی فراوان
لەڕیٚتا گیانی کەم نەرخم فیداتە
بەقوربانت هەموو خاڵان و باوان
لەتۆ بەولاوە کەس ناکەم بەیارم
نیگاران غەیری تۆ کەم نەرخ و ساوان
ئەوەی زانیوتە ناپاك و نەفامە
لەلای خۆت ناوەکەی دەرکە لە ناوان
ئەمن راستم بەهەستم مەستی عەشقم
کەهەر تۆم هەی سەراوان و بناوان

***

## قەزای تۆ لەمن

کورتەبالآکەی خنجیلەی خرپن
دڵی من بۆ تۆ قەزای تۆ لەمن
تۆ هێشتا غونچەی تازە پشکوتووی
مەچۆ بەردەرگا ناو کۆمەڵی ژن
ژن چەنەباز و بەفێڵ و حیلەن
خۆت مەخە داوی راوی درۆزن
ئەو چاوە رەشە ئەو کوڵمە گەشە
لەباخی ژینا با جیلوە دەربن
رێزی جوانی خۆت بگرە تەواو
نەکەویە تەڵەی خەنفوسی جرپن
هەر من گیانبەخشی راستەقینەتم
هەر تۆی ئاواتی رۆژ و شەوی من
***

## رابووردی بە لاما...

که رابووردی به لاما شەو بەلەنجە
دڵم زوو کەوتە لێدان وەك کەمەنچە
له گۆشەی پەنجەرەی کۆشکی بلوورا
دڵم دەرکە بە نینۆك و بە پەنجە
کە داوای ماچی لێوی ئاڵی تۆم کرد
بەقوربانی دەمت بم لێم مەڕەنجە
ئەگەرچی ساڵی ژینم ئێستە زۆرە
دڵم بە خوا بەقوربان جوان و گەنجە
له ئاسمانی خەیاڵا زۆر فڕیووم
گەیشتوومە وڵاتی فارس و تەنجە
***

## بە با چوو

هەموو ئەرکی ژیانی من بە با چوو
کە ئەو دڵدارە جوانە لێرە لاچوو
هیوای دیداری روخساری گوڵم بوو
بڕی یەکسەر هیواکەم بۆ هەوا چوو
ئومێدم بوو کە توشم بێ لە گوڵشەن
کەچی وتیان (نیگار) بۆ نەینەوا چوو
هەموو خەرمانی ئامانجم بە جارێ
کەکاتێ شەن کرا گشتی بەکا چوو
دڵم بەندەی ئەوینی رووی نیگارە
کەچی ئەمڕۆ بەدەردی ناڕەوا چوو
***

## خۆشە

شەرابی ئاڵی ناو مەیخانە خۆشە
لە پەیمان چاکترە پەیما نەخۆشە
لە عود و ساز گەلێك خاوەن سەفاتر
کە شڵپەی ماچی ئەو کوڵمانە خۆشە
لە رێگەی عەشقی یارانی جوان دا
کە قرچەی سوتنی پەروانە خۆشە
لە دنیای بێغەما سەرخۆشی دائیم
لە ژینا حاڵەتی بێ ژانە خۆشە
لەسەر ئەو گەردنە وەك زیوی سافە
زرەی ئاڵتونەکەی گەردانە خۆشە
لە تاوان و خراپە دورکەوم با
ژیان زۆر سادە بێ بێتانە خۆشە
دەبا قوربانی تۆبێ گیان و ماڵم
وەرە زۆر جەژنی ئەم قوربانە خۆشە

***

## ئەی ئەو جوانەی ؟!

ئەی ئەو جوانەی کە ئەتپەرستم
بەیادی عەشقی کوڵمی تۆ مەستم
تۆ خوای جوانی ی عەرش و زەمینی
قەت درۆ ناکا من هۆش و هەستم
دێمەلات بەشەو هەر بۆ دیدەنی
پاك و خاوێنە غایە و مەبەستم
ئەچمە ئەو پەری خۆشی بێگومان
گەر دەستی نەرمت بخەیتە دەستم
بۆ ئەوەی هەردەم لەبەر چاوم بیٚ
لەو ئاسمانە کەپرێك ئەبەستم
ئەو کاتە کەوا دوور ئەبی لەمن
ژینم هەر ژانە سەرسام و پەستم
وەك ماری ئەژدەر ناحەزی ناپاك
دوور لە گیانی تۆ ئەم دڵەی گەستم
گەر تۆ بفەرمووی بچۆرە دۆزەخ
لەژێر فەرمانی تۆدا ئەوەستم
یەزدان بەتەنیا تۆم بۆ بهێڵیٚ
بەقوربانت بیٚ گشت هەست و نەستم

***

# فیدابێ ڕۆحەکەم

به قوربانی دەم و کوڵمی گەشت بم
به قوربانی برۆ و پرچی ڕەشت بم
فیدابێ ڕۆحەکەم بۆ ناز و رازت
به قوربانی مناڵی باوەشت بم
به تۆم بەخشیوە گشت سامان و گیانم
به قوربانی هەموو گیان و لەشت بم
به پیرۆزی گەیشتیە هەژدەساڵی
به قوربانی ژیانی سێ شەشت بم
به ناحەزمان ئەدەی ماچی دەم و لێو
منیش بێ بەش به قوربانی بەشت بم
به لەنجە تێپەڕت فەرموو بەلاما
فیدا و به قوربانی رەوت و لەنجەشت بم
له جوانیدا نیه وێنەت له چەرخا
به قوربانی جوانی بێ غەشت بم

***

# کیژی جوان

کیژ که جوان بێ تەماشا ئەکرێ
گەر ناشرین بێ لێی حاشا ئەکرێ
گەر کیژ روو خۆش و دەم بە خەندە بێ
ماچی سەر گۆنای لێ تکا ئەکرێ
گەر لە خێزانی بەنرخ و بەرزە
عەرشی دڵداری پێ رەوا ئەکرێ
ئەگەر زیرەك و ژیر و زانا بێ
بۆ بەهەشتی ژین بەتەما ئەکرێ
گەر هونەر مەند و سۆزی شیرین بێ
هەزاران گیانی بەفیدا ئەکرێ
کیژی جوان ئەگەر خێزان هەژارە
بۆ هاوسەرێتی زووداوا ئەکرێ
کە گوڵی باخی جوانێتی ژاکا
زوو بەداخەوە بەرەڵا ئەکرێ
لەم کوردستانە جوانەی ئێمەدا
هەزاران هەزار کاری وا ئەکرێ
جوان کە بەد خوو بێ یان شەر فرۆش بێ
هەردەم لە دەستی سکاڵا ئەکرێ
خوازبێنی کەری ئەسڵەمێتەوە
قەت بڕوا مەکە دڵنیا ئەکرێ
***

# من و تۆ

تۆ گوڵی باغی ژیان و  بولبولی حەیران منم
تۆ هەمیشە دەم بە خەندە دیدە پڕ گریان منم
تۆ لەسەر عەرشی جوانی پادشای ئەم عالەمەی
دەست لەسەر سینە لە قاپی کۆیلە بۆ فەرمان منم
***

## ((ئەوەی ئەمڕۆ نزیکە...))

ئەوەی ئەمڕۆ  لە تۆ هەردەم نزیکە
وەکو زانیومە ناپاکە دەری کە
هەموو یاران بەجاریێ لیێ ی بە داخن
لەتەك نامەرد و بەدکاران شەریکە
نەکەی بڕوا بە (خەنفوس)ی درۆزن
لە باخی لاوی یا خام و فەریکە
کە ئەمڕۆ دڵ بەتۆدا هیچە بیێ شك
سبەی بۆ غەیری تۆیە و لیێت تەریکە
منم دڵسۆزی چاك و ڕاستەقینەت
دڵ و ڕۆحم هەمیشە لات خەریکە
***

## قەیناکا..

مەلا کە مەیلی نۆشی مەی ناکا
بۆ منی تێکە بۆ ئەو قەیناکا
بۆی تێکە بۆ ئەو بامێ و قوبوڵێ
سەد پاروو ئەخوا یەك ئۆخەی ناکا
عاشق کە ماچی یاری دەس کەوێ
ئارەزووی تەخت و تاجی کەی ناکا
دڵ بەخشەر سامی لە دڵدا نی یە
خەنجەری لێدەی ئای و وەی ناکا
قەت دڵشکاوی دەستی دڵداری
حەز لە سەمتوور و ساز و نەی ناکا
صۆفی یاری دی لەڕێی خانەقا
دەست و پێی شکا حای و حەی ناکا
هەرچی ڕێی کەوتە کەعبەی خوای عەشق
ڕێبازی صەفا و مەروەتەی ناکا

***

## دڵم پێداوی

کاتێ ئەتبینم یاخۆ دێمە لات
دڵم لێ ئەدا بەوێنەی سەعات
دڵم پێ داوی بۆچی ناتەوێ
ئەوا رۆحیشم ئەکەمە خەڵات
تەنها گیانە تۆ سایە و مایەمی
چیم هەیە و نیە ئەیکەمە فیدات
رووی جوانت ئەگەر بێت و لەمن کەی
رزگارم ئەکەی لە کۆسپی نەهات
ئەم شەو دەرکەوتی لەناو گوڵشەنا
باخەوان وتی: ئۆخەی رۆژ هەڵهات
رۆژی ئاسمان بەڕۆژ دیارە
تۆ شوعلە داری گشت سەعات و کات
***

## روحم ئەبەخشم

دڵم گیر ناکەم بۆ تاقە یارێك
رۆحم ئەبەخشم بە چەند هەزارێك
هەرچی کە جوانە لەم سەر زەمینە
من خۆشم ئەوێت لە هەموو شارێك
کیژۆڵەی مۆدەی جوان و رێك و پێك
دڵیان فڕاندووم هەموو بە جارێك
کچی دێهاتی کراس گوڵناری
ئەمخاتە داوی جوانی روخسارێك
من بە دڵپاکی نەك بە نامەردی
دڵ پێشکەش ئەکەم بە هەر نیگارێك
ئەچمە دەشت و باخ هەر بۆ دیدەنی
شۆخانی وڵات، هەموو بەهارێك
خۆزگە دەرئەچوو رۆحی رەوانم
هەر لەسەر رانی دیدە خومارێك
ئەوسا ئەمردم من بە شەهیدی
خوا ئاگادارە بە هەموو کارێك

***

# جوان پەرستی

ئەوانەی هەر وەکو من جوان پەرستن
بە پیاڵەی شەربەتی یەزدانی مەستن
ئەوانەی ئەچنە کەعبەی عەشقی یاران
بە راستی خاوەن بەرزێتی هەستن
ئەوانەی شوێنی ماڵ و پارە کەوتوون
لە گۆشەی ژینی پوچا ڕا ئەوەستن
ئەوانەی دوور لە عەشقی نەو نیگارن
لە دنیای غەفڵەتان و خوار و پەستن
ئەوانەی خاوەنی زێڕ و بیری بەرزن
لەگەڵ دڵداری هاو رازی دروستن
ئەوانەی ناگەنە عەرشی خوای عەشق
هەژارن عاجز و بێ قاچ و دەستن
ئەوانەی روو ئەکەن بۆ قەسری دولبەر
کەمەر بۆ عالەمی شادی ئەبەستن
ئەوانەی جوان پەرستن بۆ تەماشا
هەمووی رۆح پاك و چاك و خۆش مەبەستن
***

## یار شانەی هێنا

یار شانەی هێنا سەری داهێنا
لە بۆ دڵداری دڵمی داهێنا
پرشنگی چاوی جوانی خستە کار
شێخی وەك حوشتر بەچۆکا هێنا
مەلا ملی نا بچێتە مزگەوت
شمشێری عەشقی بەملا هێنا
کە رووی کردە من دەم بە خەندەوە
دڵم باوەڕیَ بە هیوا هێنا
تەمام بوو بچم بۆ حەج بۆ حیجاز
رووی تۆ ئەنجامی بەتەما هێنا
لە هەموو لاوە دڵ ئەدریَ بە یار
بەڵام یار وازی لە هەرلا هێنا
***

## دڵم دێته جۆش

که تۆ ئەبینم دڵم دێته جۆش
دەمار و خوێنم ئەکەونە خرۆش
خەریکم بفڕم وەکو فڕۆکە
بچمە ئاسمانی بێ پایان و بۆش
نەك من هەموو کەس لەم سەر زەمینە
بە دیدەنی تۆ لای نامێنێ هۆش
لە کەعبەی عەشقا هەموو وێڵی تۆن
هات و چۆیانە هەروەکو سەر خۆش
چونکە تۆ مایە و سایەی عاشقی
بۆ ماڵێ دنیا نیانە پەرۆش
چش با بچێژم تاڵاوی دنیا
خۆشی و شیرینی هەر بە تۆبێ نۆش
***

## بۆ چیه

گیانەکەم دوربی لەمن بۆ ژیانم بۆ چیه
تۆی هەموو دەم پێ نەبینم چاوەکانم بۆ چیه
با بڵێم کۆشکی بلوور و باغی پاشا هی منه
تۆم کەڵێ دووربی قسور و خان و مانم بۆ چیه
***

## دڵی گەنج

گوێ نادەمە زۆری تەمەن
یا چەرخ و دەورانی زەمەن
وەك گەنجی بێ ڕەنجی وەتەن
من ئەچمە ناو باغ و چەمەن
دڵ گەنج و لاوە مەی ئەخۆم
بێ دەنگ و دوو بێ وەی ئەخۆم
گەر ئێستە نەی خۆم کەی ئەخۆم
با خەڵکی زووڕنا لێبدەن
پیری حەریفی ژیری یە
نەك هاودەمی دڵگیری یە
تا شادی هۆی کەم بیری یە
باکم نیە باوەڕ ناکەن
وا پڕ بووە پەرداخەکەم
ئەی دەم بەبا من داخەکەم
خزمینە تانەم لێ مەدەن
پیرێکی ژیری دڵتەڕم
بۆ ژینی شادی ڕابەرم
بۆچ پێم ئەڵێن ئاخر شەڕم
بەسیە قسەی ناحەق مەکەن
یەزدانی گەورە بەخشەرە
چاکە و خراپە تاسەرە
باری شەقاوەت لابەرە
قەت بێ ئومێدی ناو مەبەن

# یار ئەشنێتەوە

یار من ئەبینیٚ زوو ئەشنێتەوە
وەك غونچەی بەهار ئەگەشێتەوە
من لەم کردارە سەرم سوڕماوە
ڕەنگە بەزەیی پێما بێتەوە
دیٚ بەرەو پیرم بەلەنجە و بەناز
دەستی بۆ دەستم ئەهێنێتەوە
رەوا نابینم ئەم لوتفە بە خۆم
رۆحم موچڕکەی پێدا دێتەوە
دەستی ماچ ئەکەم لە جیاتی گۆنای
دەرگای پیرۆزیم لیٚ ئەکرێتەوە
بە گەرمی لوتفی ئەم نەو نیگارە
بەفری چیای غەم وا ئەتوێتەوە
بۆمن جار و بار تروسکەی شادی
ئومێدەوارم دەرکەوێتەوە
***

# باخۆس

((باخۆس خوای بادەی دڵخۆشی یە))

(باخۆس) ئەی خوای بادەی دڵخۆشی
وام لە گێژاوی غەم و خامۆشی
سا دەستم بگرە زوو دەرم بێنە
رزگارم بکە لەدەست بێ هۆشی
بم بە بۆ باخ و گوڵزاری شادی
بمخە زەمزەمەی یارانی خۆشی
با ئاسودەبێ گیان و ژیانم
کاتم بەسەر بەم بە بادە نۆشی
ژین بە خشایشی یەزدانە وەلێ
نابێ تێپەڕێ هەروا بە بۆشی
ئەی دڵ تکایە کاتێ بسرەوە
لە دنیای شادی گەرەك بجۆشی

***

# هێزی دڵداری

((ئەم (هێزی دڵداری یە) کە وەڵامی پارچە شیعرێکی مامۆستا گۆرانە، لە بەشی یەکەمی دیوانەکەم دا ((گوڵ و خونچە)) لاپەڕە (٦٤) بڕگەیەکی لەبیر چووە و چاپ نەکراوە، ئێمەش بە پێویستمان زانی لە بەرگی دووەمی ئەم دیوانە بە تەواوی بینوسینەوە و پێشکەشی خوێنەری بکەین.))

گەر باخی پاشا لەوبەر ئاویش بێ
بەهۆردوی دوژمن ڕێ گیراویش بێ
بەشورەی پۆلا بەستراویش بێ
ئەبمە شاباز و هەڵمەت ئەهێنم
لەباخچەی پاشا گوڵ بۆ یار دێنم
هێز نیە لەبەر هێزی دڵدارا
کە خۆی ڕاگرێ لە دەشت و شارا
لەناو ئاگر و دەریا و کۆسارا
بەئیمانی عەشق قەڵا ئەشکێنم
بنچینەی ستەم لەبن دەردێنم
یار بۆ چەپکێ گوڵ تەشریفی بێنێ
فرمێسکی عەتری لەچاو بڕژێنێ
زۆر عەیبە عاشق کە دابمێنێ
گیان فیدا ئەکەم هونەر ئەنوێنم
بۆ ئاواتی یار چۆن دائەمێنم
***

## نەشئەی نیسان

خۆشی و دڵشادی وا نمایان بوو
ئەمەش لە سایەی نەشەی نیسان بوو
دەستگیری من بوو ماچی کولْم و لێو
یار پێمی بەخشی دەمەو بەیان بوو
دەستم خستە سەر مەمکی پرتەقاڵ
گەرم و ناسك و نەرم و نیان بوو
لە هەموو ژینا کەی ئەمەم دی بوو
خۆشترین کاتی هەلی ژیان بوو
ئەو عومرە پوچەی لە ڕابردوودا
تێپەڕ بوو هەموو ژان و زیان بوو
***

## لاچۆ برۆ ؟

ئەی یارەکەی تورە و تڕۆ
بە عەشقی تۆ بووم دەسخەڕۆ
هاتومە لات بۆ دیدەنی
کەچی ئەڵێی لاچۆ بڕۆ
ئەی یارەکەی لەیار نەچوو
لە خونچەی نەوبەهار نەچوو
لە کیژی بەهرەدار نەچوو
تەفرەی منت دا بە درۆ
منێکی دڵپاکی هەژار
خاوێن وەك ئاوی سازگار
نە فێڵبازم نە نالەبار
وا بووم لەدەس تۆ ڕەنجەڕۆ
***

## (کانی عاشقان)

چومە گەرەکی (کانی عاشقان)
وتم بزانم چی تیا ئەبینم
لەویێ تووشم بوو پۆلێ کچی جوان
لێ یان فڕاندم ئیمان و دینم

...

دوو لەو کچانە کە هەورامی بوون
وەکو فریشتەی یەزدانی گەورە
دەم بە خەندەوە بۆکانی ئەچوون
دڵیان خستمە جەولان و دەورە

...

دوانی تریشیان کەنیشکە جافن
وەك غونچەی بەهار گەشابوونەوە
جوانێکی راست و شۆخ و بێ لافن
گیان کەوتە دنیای خۆش و روونەوە

...

چوار کچی تریان شارەزووری بوون
لە دنیای جوانی وێنەیان نەبوو
بۆ گیانی عاشق جێی سەبووری بوون
گەلێك شیرینی عیشوەیان هەبوو

...

کەلێم تێپەڕین کەوتم بەبێ هۆش
شەوی تاریکم بەچاوی خۆم دی
بەجارێ ژینم لابوو فەرامۆش
کەوتم بە وێنەی مردووی ئەبەدی
***

# پەروازی خەیاڵ

کیژە جوانەکەی نزیك جولەکان
شەو تەشریفی هات بۆ ماڵێ خۆمان
وتی: لەدەستی دایکم هەڵاتووم
بەیادم کردی بۆ لای تۆ هاتووم
ئەمزانی لەماڵ کە تاك و تەنیای
بۆ هاودەمێکی وەك من بە تەمای
ئەبمە هاودەمی خۆشی شەوگارت
ئەمشەو تا بەیان ئەبم بە یارت
سازی کە بەزمی شەرابی سادە
خەمت بە ماچ و بەبادە بادە
نۆشی کە پیاڵەی پڕ کامەرانی
گوێ مەدە چوونی رۆژانی جوانی
لە ژینا هەڵت بۆ هەڵکەوتووە
لە دەستی مەدە هەتاکو زووە
ئەمشەو لە باخی سینە و مەمی جوان
تۆ باخەوان بە تا دەمەو بەیان
ئەبەخشم بە تۆ گۆنا و لەش و لار
لەناو بەهەشتا ببە بە سەرکار
سینەی زیوین و مەمکی پرتەقاڵ
کوڵمی بلوور و لێوی جوان و ئاڵ

بەبێ پرس و باس ئەسپێرم بە تۆ
تاکۆ رۆژ هەڵدێ لە گۆشەی ئاسۆ
هەرچەندە زۆرە تەمەن و ساڵت
دڵم ئەسوتێ بەشێوەی حاڵت
لە دڵی خۆم دا پەیمانم داوە
لە باخی جوانیم بچیە صەفاوە
پۆشیبووی نیگار بەرگی گوڵناری
سوخمەی سەهۆڵی عەقدی مرواری
کوڵمی وەکو رۆژ ئەدرەوشایەوە
لێوی وەك خونچە ئەگەشایەوە
وتم: ئەی یاری فریشتە شێوە
زۆر منەتبارم لە لوتفی ئێوە
ئێستاکە ئەمن وەها ئەزانم
لەناو بەهەشتا کە باخەوانم
لەگەڵ یەك حۆری شیرین بە شادی
ئەنۆشم بادەی خۆشی ئازادی
شارەزای رێگەی شادی ژیانم
لەم هەست و نەستە زۆر باش ئەزانم
لە خۆشیدا بووم هەتا رۆژ هەڵات
گیانم گەیشتە ئەو پەڕی ئاوات

بۆم باس ناکرێ چۆنم رابوارد
چۆن دێوی غەمم بە بە دۆزەخ سپارد
فریشتەی شادی چۆن هاوڕازم بوو
بەجێ هێنەری گشت نیازم بوو
لە هەموو ژینما هەر تاقە شەوێ
ئەستێرەی تالع ویستی دەرکەوێ
ئەمەش پێ ی ئەڵێن پەروازی خەیاڵ
لە ئاسمانی بێ هەوری بەتاڵ..
***

له غەزەلێکی تەواو ئەم دوو دێڕەم لە یاد ماوە...
بۆچی رانایەت لەگەڵما ئاسکەکەی کانی ئاسکان
بۆچ لەسەر داوای ماچێ سەد کەڕەت دڵمی شکان
بۆچ بەلاما دێت و دەڕوا ناڵێ تۆ کێ ی و چی ئەکەی ؟
تۆ نیهالی باغی عەشقی یا چڵ و چێوەی خەزان
***

## کە یەزدان کردی

کە یەزدان کردی من بگەم بە تۆ
مەرگ و نەمانیش ئەگرمە ئەستۆ
گەیشتن بەتۆ گەلێك زەحمەتە
مەگەر دانیشم هەر دەستە و ئەژنۆ
تۆ هومای منیش واشەی باڵ شکاو
ناگەم بە سایەت بش بم بە هەڵۆ
ئەوەم پێ ئەکرێ بپاڕێمەوە
ناگرم رێگای پیلانی درۆ
گیانەکەم دڵت بسوتێ بەمن
با نەبمە شێتی هەردە و دەشت و کۆ
گەر هی من بوایە ئەمبەخشی بە تۆ
(دەلێن) و (زەڵم) و هەموو (بەکرەجۆ)
بەڵام شك ئەبەم کاسی و کەساسی
نیە وێنەی من پەست و ڕەنجەڕۆ
***

## شیننامه بۆ خوا لێ خۆش بوو
## عبدالله لطفی که له رۆژی ١٩٧٤/١٠/٦

کۆچی دوایی کرد...

دەنگێ بەرز بوو له عەرشی یەزدان
هێندە بەسۆز بوو جەرگی ئەسوتان
دەنگێکە وا بوو بەتین و بەرزی
عەرش و زەمینی لەتاو ئەلەرزی
خاکی عێراقی هێنایە خرۆش
دەریا و بیابان گشتی هاتە جۆش
ئەو دەنگە ئەی وت: ئەی ئەهلی زەمین
ئەزانن کەچی رویداوە له ژین ؟
ئەزانن ئاخۆ کەچی قەوماوە ؟
دایکی زەمانە جەرگی سوتاوە !
رۆڵەی بەنەرخ و بەرز و تاق و فەرد
(عبدالله لوتفی)، کۆچی دوایی کرد
ئەو مەردە تاکە بەلوتف و چاکە
هاوتای هەر نەبوو لەسەر ئەم خاکە
بۆ کەس و کاری باوك و برا بوو
بۆ تاریکی ژین شوعلەی چرا بوو
بۆ ئەهلی وڵات لە عارەب و کورد
بێ فەرق و جودا خزمەتی ئەکرد
له بەخشایشا وێنەی حەتەم بوو
قارەمانێکی عەتف و کەرەم بوو

لە روو خۆشیا گوڵی بەهار بوو
وەك رۆژی هاوین دایم دیار بوو
داخی گرانم بۆچی وەها زوو
بێ دەنگ و ورتە لە دنیا دەرچوو
ئێمەی هەژاری خستە دەریای شین
بوینە هاوڕازی ناڵین و گرین
خێزان و خوشك و هەموو کەس و کار
بە جۆش و خرۆش ئەکەن ناڵەی زار
هەرچی بۆ بکرێ هێشتا هەر کەمە
ناکەسە ئەوەی بۆ ئەو بێ غەمە
من کە خزمێکی دوور و هەژارم
لە گێژاوی غەم بۆی بێ قەرارم
زۆر حەزم ئەکرد کەمن بومایە
لەجێی ئەو گیانم فیدا کردایە
چونکە مانی ئەو خێر و رەحمەت بوو
لابەری هەزار کۆسپ و زەحمەت بوو
ئینجا منێکی بێ سایە و مایە
کە لەدنیادا چیم لەدەست نایە
بە کەڵکی چی دێ مان و ژیانم
بۆ خۆم و کەسم زیان و ژانم
بەڵام ئەو مەردە ئەگەر بمایە
بۆ خۆم و کەسم ئەبوو بە سایە

بۆ برا و خوشکو خزمان و خێزان

لەدوای تۆ نەمان چاترە لە مان

بەهاری شادیت لێ بوو بە خەزان

تۆ وا ئەچیتە بارەگای رەحمان

زۆر بە سەربەرزی بێ سام و ترسان

بەهەشتە جێگەت بێ شك بێ گومان

لەگەڵ کۆمەڵێ چاکان و پاکان

کە دێتە یادم نوکتە خۆشەکان

شیعر و چیرۆك و ووتاری جوان

تك تك ئەرێژم فرمێسکی گریان

دەرون و دڵم ئەبێ بە بورکان

دڵ بەکێ خۆشکەم ئیتر لە جیهان

کێ لەدووی ئێوە بێتە پشتیوان

رەحمەت لە گۆڕت زۆر بێ پایان

هەتاکو ماوە زەمین و زەمان

***

## شیننامە بۆ احمد عزیز ئاغای مامم
## کە لەمێژووی ١٩٦٨/١١/٤ کۆچی دوایی کرد

ئەڵێن: مامت مرد چۆن بکەم بڕوا ؟
ئەڵێن: کۆچی کرد بۆکام لا ئەڕوا ؟
ئەڵێن وا ئەیشۆن لەسەر تاتە شۆر
لەپاش دوو سەعات ئەیسپێرن بە گۆڕ
ئەڵێن: ئەو مامە زانا و زیرەکە
دەمی لێکناوە ئینکاری مەکە
ئەڵێن: ئەو مامە نوکتە شیرینە
وازی هێناوە لەم دنیای ژینە
ئەڵێن (ئەحمەدی عەزیز) ئاغایە
ئەمڕۆ لەم چەرخە وا بێ ئاگایە
چوومە پێشەوە دیم مامی زانام
مردوو شۆر ئەیشوا وەك تیفلی ناکام
دیم مامی جوان و باش و بەڕێزم
راستە مردووە لێم بڕا هێزم
دام بەسەر خۆما گریام نالآنم
ئەشکی خوێناوی کەوتە چاوانم
لە خاك و خۆڵا خۆم تلانەوە
برینی کۆن و نوێم کولانەوە
کەسان لەدەورم دا کۆبوونەوە
بۆ دنیای غەم و هەم ئەچوونەوە

## شیننامه بۆ (ژیان)ی جوانەمەرگ

**ئەم شین نامەیە لەلایەن دەستە خوشکانی (ژیان عبدالرحمن)ی جوانە مەرگەوە لەسەر گۆڕەکەی خوێندراوەتەوە**

ژیانی نازدار ژیانی شیرین
غونچەی جوانەکەی گوڵزارەکەی ژین
تازە پشکوتووی باغەکەی ئاوات
نەمامی کۆرپەی گوڵشەنی وڵات
بۆچی کۆچت کرد هێشتاکە زوو بوو ؟
خۆتۆ دڵشادیت زۆر ئارەزوو بوو
تۆ لەگەڵمانا ئەشنایتەوە...
سەعات بە سەعات ئەگەشایتەوە
کوا زەردەخەنەی شیرین و نەرمت
کوا دڵسۆزیەکەی بەتین و گەرمت
کوا ورتەی خۆشت کوانێ ئاوازت ؟
کوانێ ئامانج و راز و نیازت ؟
دایانە دەستت شەربەتی ئەجەل
خێرا نۆشت کرد وا بە پەلە پەل
خۆتۆ ئاواتی دایکی هەژار بووی
مایەی دڵشادی گشت کەس و کار بووی
شوعلەی ئاوێنەی ماڵ و یانە بووی
پرشنگی خۆری قوتابخانە بووی
بێ خوا حافیزی لامان ڕۆیشتی
تا سەر لەگەڵمان تێر دانەنیشتی

مەگەر لە ئێمە گیانە بێزار بووی ؟
یان لەم گەردوونە دڵ بە ئازار بووی
ڕۆیشتی داخت نا بە دڵمانا
فرمێسکی ئەڕێژین لەتەك گریانا
ئەی خاکی پاکی پوختەی گۆڕستان
میوانی تۆیە ئێستاکە (ژیان)
هاتۆتە لای تۆ چاك بی لاوێنە
لەشی ناسکی هیچ مەژاکێنە
بیگرە باوەشت وەك کۆرپەی شیرین
ئازاری نەدەی با نەبێ غەمگین
ژیان خوشکانت وا هاتونە لات
چەند دەسکە گوڵت پێ ئەکەن خەڵات
هەموو بە دڵی پڕ ئازارەوە
چاو بە فرمێسی بێ شومارەوە
هەستی غەمباری خۆیان دەر ئەبڕن
بەدەستی لەرزیو چاویان ئەسڕن
***

## داری وشك

داری كۆنی وشك ناچەمێتەوە
خۆت خەریك مەكە با نەشكێتەوە
پیری بەدكاری خواری بێ ڕەوشت
بۆ ڕێگەی چاكە نا گەڕێتەوە
بەدخوو ئەگەر چی بچێتە مزگەوت
لەو خووا ناسی ناوەشێتەوە
تۆوی خراپە هەركەس بیچێنێ
بەرهەمی چاكە نادورێتەوە
ئەوەی هاوكاری عەقڵ و ویجدانە
لە پیشەی ناپاك ئەسڵەمێتەوە
***

# زەوی شۆرەکات

زەوی شۆرەکات گوڵی ناڕوێنێ
نابێ کەس تۆوی تێدا بچێنێ
مرۆڤ نا کەس بێ بە پادشاش بێ
کاری ناکەسی خۆی هەر ئەنوێنێ
هەتیوی مالأن شوومی کاسەلێس
قەت باوەڕ مەکە برەو بسێنێ
ئەو وەجاخ زادەی جنێو فرۆشە
وەك فەرشی دڕاو نەرخی نامێنێ
ژنی دەمپیسی ناپاك لە مالأ
بناغەی کۆشکی ژین ئەڕوخێنێ
منالْ گەلێ باش تەربیە نەکرێ
دوا ڕۆژی ژینی خۆی ئەدۆڕێنێ
نەفام لەکاتی قسە کردن دا
دڵی گوێ گران بێ شك ئەشکێنێ
پێویستە بەرگ و لەشی خاوێن بێ
ئەوەی قورئانی پیرۆز ئەخوێنێ
پارە سەرمایەی خۆشی ژیانە
مرۆڤ بەژیری بەکاری بێنێ
ئەوەی سەرۆکە یا کار بەدەستە
نابێ قەت بە فیز خۆی هەڵفڕێنێ
سەرم سوڕماوە لەم کاری چەرخە
ئاخۆ سبەینێ چیم بەسەر دێنێ
***

# له دوای مردنم

(عەلی) تۆ ئەمریت، هەموو کەس ئەمرێت
بەڵام کە مردی کێ جێگەت ئەگرێت
ئەو جێگەی کەوا هیچ کەس نایەوێ
کەس بە ئومێدی جێگەت ناخەوێ
سەرمایەت تەنها کۆمەڵێ شیعرە
ئەویش بە لاستیك تەواوی بسڕە
له دوای مردنت کێ بۆ تۆ ئەگری
خۆزگە ئەتوانی گوێ یان لێ بگری
کوڕ ئەڵێ: باوکم عەمری درێژ بوو !
بی موبالات و زۆر هەرزە بێژ بوو
کچ ئەڵێ: باوکم دەستی قوچاو بوو
بەرامبەر ئێمە زۆر ناتەواو بوو
ژن ئەڵێ: ئۆخەی رزگارم بوو من
دڵی کردبووم سەراپا کون کون
عەمری نەمێنێ هەروەکو نەما
بۆئەو دڵی خۆم نادەم بە خەما
خوشك کەبۆ من عاتیفەی کەمە
ئەویش بۆ مەرگم سارد و بێ غەمە
نەوەی کوڕ و کچ خام و مناڵن
رەنگە دوای مەرگم نەختێ بناڵن

منیش تا ماوم بڕیارم داوە
خۆم نەکەم بە توش خەمی دنیاوە
با کەس و کارم چی ئەڵێن بی لێن
چ بە ئاشکرا یاخۆ بە نهێن
دڵم ناخەمە بەندی غەمباری
بێ باك و زۆر دوور لە نالەباری
هەرچی کە هەمە ماڵ و دەرامەت
ئەی خۆم نایکەمە سەرمایەی خەفەت
بۆ کوڕ و کچ و ژن و کەس و کار
ڕۆحم نادەمە دەستی ڕۆژگار
***

## بۆچی بمێنم

به کەڵکی چی دێم بۆچی بمێنم
بۆچ توخمی داخ و خەفەت بچێنم
بەرهەمی ژینی من ئەبێ چی بێ
سامانی ژیان چی پێ بسێنم
سەرمایەم هەموو کۆمەڵێ شیعرە
لە دەفتەرێکا هەر ئەی خەوێنم
خێزان پێم ئەڵێن کەتێ بکۆشم
بۆ خۆشی ژیان قەت دانەمێنم
بەڵام کە هێز و تووانام نەبێ
چۆن بچمە مەیدن هەڵمەت بهێنم
بەختەکەم پەستە خۆشم کەم تینم
لە زەوی شۆرا چۆن گوڵ بڕوێنم
***

## ئەڵێن و ئەڵێم....

دۆست و کەسان پێم ئەڵێن
بدە بۆ چاکە بەڵێن
ئەڵێم: نیمە خراپە
دوورم لە تانە و لە جوێن
ئەڵێن: خۆت بکە بە میر
بۆ خەڵکی بەرە دەسگیر
ئەڵێم: بەمن ناکرێ
بە فێڵ و درۆ تەدبیر
ئەڵێن: ببە بە مەلا
لە خانەقای (شێخ عەلا)
ئەڵێم: ئەم کارە سەختە
بۆ مرۆڤی لابەلا
ئەڵێن: ببە بە دەروێش
لە لای شێخی خەڵوەکێش
ئەڵێم: بۆ من چاك نیە
هەر گیزەم بێ وەکو مێش
ئەڵێن: ببە بە وەستا
هونەرت وا لە دەستا
ئەڵێم: بێ تین و تاوم
ئێستا لە کار و هەستا
ئەڵێن: ببە بە سەرۆك
لە بۆ بێکار و گەڕۆك

ئەڵێم: بۆ پول و پارە
ناگرم یەخە و بەرۆك
ئەڵێن: ببە بە دەستبڕ
بەسە هێندە سارد و سڕ
ئەڵێم: بۆ گەنجی بێ ڕەنج
بابم بە مەردێکی دڕ
ئەڵێن: خۆت بکە بە دز
ئەگەر لە ژین بووی وەڕز
ئەڵێم: بێ جگە بەدناوی
لە مە دەست ناکەوێ مز
ئەڵێن: ببە قومارچی
گوێ مەدەرە چۆن و چی ؟
ئەڵێم: من هەر دۆڕاوم
بردنەوەش بەتۆ چی ؟
ئەڵێن: ببە دلاوەر
وەکو ڕۆستەم و عەنتەر
ئەڵێم: من زۆر ئەترسم
لە شیر و تیر و خەنجەر
ئەڵێن: بادە بنۆشە
کە صەفا بەخش و خۆشە
ئەڵێم: زۆر باشە بەڵام
تێکدەری عەقڵ و هۆشە
ئەڵێن: گۆرانی بێژە
خۆشی ژیان بچێژە

ئەڵێم: ناسازە دەنگم

ئاوی رووم پێ مەڕێژە

ئەڵێن: ببە بە ئاغا

بژی لە قەصر و باغا

ئەڵێم: ئاغای بێ نۆکەر

زوو شەق ئەبا لە داغا

ئەڵێن: ببە بە شۆفێر

لێ خوڕە بەرەو هەولێر

ئەڵێم: ئیجازەم نیە

لەم کارە بوومە نەوێر

ئەڵێن: دانێ مەیخانە

لە گەڕەکی مۆردانە

ئەڵێم: من موسوڵمانم

ئەمە بۆ من گرانە

ئەڵێن: بچۆرە حیجاز

بۆ بارەگای کارساز

ئەڵێم: نابم بە حاجی

بۆ ئەمە نیمە نیاز

ئەڵێن: روو لە خووا بکە

بگرە ڕێبازی چاکە

ئەڵێم: من خوا ئەناسم

کە بەرز و چاك و پاکە

ئەڵێن: دەربچۆ لە شار

بچۆ هاوینە هەوار

ئەڵێم: ناکرێ بێ پارە

بگەڕێم باغ و مەزار

ئەڵێن: دور بە لە خزم

ئەتکەن کەساس و نزم

ئەڵێم:خۆشم ئەیزانم

لە گەڵێکیان وەڕزم

ئەڵێن: ببە بە قەشمەر،

بە گاڵتە ژین بەرە سەر

ئەڵێم: سوکی لە دوایە،

ئەم پیشەیە بۆ بەشەر

ئەڵێن: ببە بە سۆفی

لە ژین بێ ئاخ و ئۆفی

ئەڵێم: گەلێ سڵئەکەم

لە های و هۆی بلۆفی

ئەڵێن: بە وادەی درۆ

نەکەی ببی دەسخەڕۆ

ئەڵێم: من ماران گەستەم

لەسەر سەرم قسەی تۆ

ئەڵێن: وا چووی بە ساڵا

بێ دانیشە لە ماڵا

ئەڵێم خۆ من نەمردووم

خۆم بنێژم لە چاڵا

ئەڵێن شاعیری گەل بە
هەر ئاگاداری هەل بە
هەرچی ئەڵێن با بڵێن
نا دەم بە هیچ کەس بەڵێن
خۆم رێبازم شارەزام
تا لە گیانمایە خوێن
ئینجا ئێستا من ئەڵێم:
کەمن کێم و کوڕی کێم ؟
مرۆڤێکی هەژارم
ئەزانم ڕێباز و جێم
سەختی ناخەمە پێشم
نابم بە کۆسپی خوێشم
پەیمانم داوە بە قەد
بەڕەی خۆم پێ ڕاکێشم
خۆم دوور ئەخەم لە بەدکار
ئەبمە هاودەمی هەژار
چیم لە دەست بێ لە چاکە
ئەیکەم بێ ترسی پلار
ئیتر لە دوا وتارا
هەرچیم هەبوو لە بارا
وا بڵاوم کردەوە
بەناو مەردانی شارا
***

## هەمەڕەنگە

ئەوەی کەڕابێ بەژینی ناخۆش
گیانی سڕئەبێ بەوێنەی سەرخۆش
ئەوەی بێ پەروا ئەژی لەسەربۆش
کتلی چاییەکەی بەترِ دێتە جۆش
کەلەدەم دەرچوو پارووکەو تەکۆش
سەرمایە بوو بە مایەی پیاز فرۆش
سەرم سووڕماوە منیش وەك (مەدهۆش)
هەردوو کەوتووینە ناوشاری خامۆش
مەی ئەخۆم بە پێك حەوت و هەشت و نۆش
نامەوێ کەسان کە پێم بڵێن نۆش
کاتێ ماست نەما ئەی ژەنین بە دۆش
ناچار من ئەی خۆم،ئەگەر نەی خۆی تۆش
ڕاستی کۆچ بکا فێر ئەبین درۆش
ئەچینە حەلقەی شێخی کۆنە پۆش
گیانی دز بۆ زێر زوو دێتە ئالۆش
بۆماڵی حەرام هەیە تی پەرۆش
تانەی جوڵێنن نایەتە خرۆش
هەتا کەسانی زۆر خوێری و خەرۆش
گەر زۆر بە باشی ڕۆڵەت بکەی گۆش
ئەبێتە کویلەت وەك ئەلقەی لەگوش[1]
سەرمایەی ژینم هەبوو چل قرۆش
ڕێستیان خواردم بە ((ستریت فلۆش))

*****

---

[1] گۆش: گوێچکە

## گورگە رەش

من هەمە بە خوا مەترسی گورگە رەش
بۆچ هەوالی من ئەپرسی گورگە رەش
من نیە بڕوام بە تۆ خاوەن ستەم
زۆر خراپ و چارە قورسی گورگە ڕەش
قەت فریو ناخۆم بە لوورەی نەرمی تۆ
زالم و لە خوا نەترسی گورگە ڕەش
کەوتیتە ناو ڕانەکەم بێ ترس و باك
هەروەکو شەیتانی برسی گورگە ڕەش
زوو ملی چەندان پەزو بەرخت شکاند
چل هەزارو صەد لەگەڵ سی گورگە ڕەش
گوێت نەدایە دەنگ وهاواری ئەمن
دیارە زۆر بێ ڕەحم و خرسی گورگە ڕەش
بێ گومان گوم نابێ ئەم بێدادی یە
لای خووا کەی عەرش و کورسی گورگە ڕەش

****

## لەداوێنی چیای ژینا

لەداوێنی چیای ژینا منی ئاوارە وەستاوم
گەرەکمە سەرکەوم بۆ کەل بەلاّم بیّ هیّزو داماوم
کە هەنگاویّ دەنیّم هەنگاو دووهەم یاریدەم نادا
نیە ئومیّدی سەرکەوتن لە بەر کەم تینی هەنگاوم
ژیانیّکی پەریّشانی سەراپا هاودەمی ژانە
سەرم سوڕماوە بەم حالّە هەتا ئیّستا کە چۆن ماوم
لە دەشتی چۆلّی ناخۆشا نیە هاودەنگ و هاورازیّ
ئەڕۆم مەستانە ڕیّبازی ئەمەل دوورە لەبەر چاوم
لە یەزدان من تکا کارم چرایەك دەرکەویّ بەلّکو
بچم من ڕوو بە ئاوەدانی تا لیّرە نەخنکاوم
****

## ڕەنجام؟

ڕەنجام بە شادی لە ژیان لە گیان
ڕەنجام لە غەم و لە داخ و لە ژان
ڕەنجام لە پەستی ڕۆح لە نە بوونی
ڕەنجام لەماڵ و لە حاڵ و سامان
ڕنجام لە چاکەو مرۆڤایەتی
ڕەنجام لەپیشەی خراپی کەسان
ڕەنجام لە شێخ و دەروێش و مەلا
ڕەنجام لە قە شەو مالوم و مەتران
ڕەنجام لە هاوڕێ لە دۆست و هاودەم
ڕەنجام لەبراو لە هەموو خزمان
ڕەنجام لە گوڵ و گوڵزارو چیمەن
ڕەنجام لە دڕك و داری بیابان
ڕەنجام لە بەزم و ئاوازی شیرین
ڕەنجام لە ئاهو هاوارو گریان
ڕەنجام لە لێوی پڕ زەردە خەندە
ڕەنجام لە چارەی تاڵی بەد نیشان
ڕەنجام لە ڕەنجی هەژارو کەساس
ڕەنجام لە گەنجی بێ ڕەنجی مەردان
کە من بڕەنجم وە یا نە ڕەنجم
هیچی لێ نایە زەمین و ئاسمان

بەلآم من داخی دڵ بە با ئەدەم
چونکە بێزارم لە ئەرکی ژیان
(شاری)ئەوەندە زارو غەمبارە
وڕێنە ئەکا هەردەم بێ وچان
*****

## کە شێر ون بوو چەقەڵ ئەلوورێنێ

لە ناو بێشکە شێر ونبوو چەقەڵ بۆخۆی ئەلوورێنێ
وەیا ڕێوی تەرەس بێ ترسە کلکی هەڵ ئەسوورێنێ
کەشوعلەی بەرقی یەزدانی لە ئاسۆدا بروسکەی دا
دڵی بێ نەرخی نامەردان لەگەڵ ترسا ئەلەرزێنێ
ئەوەی ئازایە بێ باکە لەلای دنیا کە ئاگربێ
قەڵای پۆڵا بە دەستی هیمەتی وەك شوشە ئەشکێنێ
ئەوەی ڕیسوایە لای وایە هەموو کەس چەشنی ئەو وایە
بەڕێگەی چەوت و ناڕێکا وەکو کەر هەڵ ئەتیزێنێ
لەبەر چاوی نیە دواڕۆژی،خۆی و خزمی و یارانی
ئەوەی ئەمڕۆ لە باخی نا کەسیداخۆی ئەگەوزێنێ
بەڕووخۆشی درۆی دوشمن فریو قەت نادرێ زیرەك
بەڵام بێ هۆش و بێ قیمەت بە سەهلی خۆی ئەدۆڕێنێ
لە خودا بەولاوە کوردستان کە دین و ئاینە بۆ من
گیان بۆ ئەو فیدا نە کرێ ژیان هیچ جلیوە ناسێنێ
بڵێن: بەو نالەبارانەی کەوا دەرچوون لە ناو پەردە؟
کەمێ شەرم و شەرەف باشە زەمان بەم حاڵە نامێنێ
بەسە سەرپۆشی بەد ناوی نەدەن هێندە بەسەریانا
کە میللەت باوەڕی هەرگیز بەخائین چونکە نامێنێ

****

# پێنج خشتەکی یەك لەسەر یەك

شیعری پیرەمێرد...

خودا چۆن بەشێك بە ئێمەت سپارد
بە هەندێك زۆرو هەنێ کەم و سارد
ئەم بەشە سەیرە بۆ مرۆڤت نارد
((یەکی وەستا بوو پارەی ئەژمارد
یەکێکیش داماو بۆ کاسەیەك ئارد))
*****

## لە کوورەی میحنەتا

لە کوورەی میحنەتا سووتاوە گیانم تێ مەگە ماوم
لە گۆڕستانی بەدبەختی بنێژن تەرمی سوتاوم
شعوورم بێ شعووری بوو ژیانم ژان و زیللەت بوو
لە پێش مەرگی حەقیقی دا ئەمە چل ساڵە فەوتاوم
لە کاتی عومری لاوی دا هەژاری هاودەمی من بوو
لە پیریش دا بەدەردی دڵ پەرێشان و پڕوکاوم
ئەمن مردوویەکم لاکین ئەڕۆم بێ هۆش و بێ هەستم
بە وێنەی داری واوەیلا لە وەیلا ڕوت و داماوم
***

## فیدات بم

فیدات بم کیژه ساواکەم،
لە من گویٚ بگرە ئەی (تارا)
کە بویتە بووکی کوردستان،
بە سەر خۆتا نەدەی تارا
کە بوویتە مەشخەڵی جوانی،
لە دنیای خۆشی لاویدا
دەمت پڕخەندەبیٚ هەردەم،
وکو غونچە لە گوڵزارا
بینایی چاوەکەم(بینا)،
ئەتۆش پارچەی لە ڕۆحی من
فریشتەی گوڵشەنی ژینی،
نیە وێنەت لە ناو شارا
بە قوربان گیانی شیرینم،
گوڵە نازدارەکەی ژینم
کە تۆ خۆت جوان و شیرینی،
وەهاش بە هەر لە کردارا
کە مردم تۆ لەگەڵ تارا،
وەرن بگرین لەسەر گۆڕم
لە گوڕا دوور ئەبم ئیتر
لە ناخۆشی و لە ئازارا
***

## گەشتێك

لە دنیای خەیاڵ.....

چوومە هەر باخێ گوڵێکم چنی
چوومە هەر شاخێك غارێکم تەنی
چوومە هەر دەشتێ بۆ سەیرو گەشتی
لە جوانی سروشت دڵم پێکەنی
چوومە سەرکەژی قەندیل و ئاکۆ
لە کاری یەزدان گیانم ڕاچەنی
چوومە کەناری ڕووباری سیروان
سەری سووڕ هێنام جوانی دیمەنی
چوومە (سەرچنار) شێوەی بە هەشتە
بە ئاوی جوان و باغ و گوڵشەنی
چوومە (تەوێڵەو) و (بەڵخەو) و (بیارە)
بوومە حەیرانی باخ و بەندەنی
چوومە(شارەزوور) لە چەم بەرەو ژوور
مایەی شادی یە کێڵگە و چیمەنی
چووم بۆ (دوکان)و بۆ ( دەربەندی خان)
خۆشترین سایەن بۆ دڵ ڕەوشەنی
ئینجا سووار بووم (مافوری هەوا)(١)
کە فەزای ئەبڕی بە شۆخ و شەنی
چوومە تورکیا بە شی کورد نیشین
گریام لە کردەی گەردوونی دەنی

له ویٚ ڕووم کرده ولاٚتی (ئەرمەن)
دڵیان جولاٚنم گولٚ و سەوسەنی
ئەم خاکە هەر چیم دی هەر جوان بوو
له سیحری جوانی بوومە ئەرمەنی
بە سەر (ئاراسا) هاتم بۆ ئێران
بەیادی کاوەی شێری وەتەنی
چوومە مەڵبەندی کوردستانەکەی
دیم شارو باخ و کەژو دامەنی
جوانی خواکردی گشتی تیا جەمە
بەیان ناکریٚ بەیەك دیدەنی
باخی، مرۆڤی،یانەی، شەقامی
هەوای، یارانی تازە تەمەنی
وێنەی کەم هەیە لەسەر زەمینا
بە فیدایان بیٚ (ڕۆما) و (لەندەنی)
باخسوس شاری (سنه و ئەردەبیل)(٢)
شێوەی بەهەشتی زەوین (ئەزبەنی)
چوومە (سەقزو) و (بانە) و (مهاباد)
(قەلاٚی مەریوان)،(پاوە) و (کەیمەنی)(٣)
بۆم باس ناکریٚ چیم دی لە خۆشی
له باخ و شاخ و کۆشك و مەسکەنی
***

دەریاو ڕووبار و دەشت و مەزاری

لە سەوزەو میوەو لە خواردەمەنی

لە نیگارانی شۆخ و بالاّ بەرز

لە ئاسکانی خەتاو خۆتەنی

لە مرۆڤانی بەرز و بەڕێزی

وێنەی (هەیاس) و (حەسەن مەیمەنی)(٤)

کە گەڕامەوە لەم گەشتە خۆشە

بناغەی کۆشکی شادیم هەڵچنی

ئەمە گەشتێك بوو لە دنیای خەیاڵ

تان و پۆکەیم بەوردی تەنی

(١) مافوری هەوا: واتا (بساط الريح) کە هی حەزرەتی سلیمان بووە.

(٢) سنە و ئەردەبیل: دوو شاری کورد نشینن لە ئێران دا.

(٣) ئەم شارانە دیسان کەوتونەتە ئێرانەوە

(٤) هەیاس و حسێن مەیمەنی: دوو وەزیر و پیاو ماقوڵی سوڵتان محمودی سەبوك تەگینن..

***

بە بۆنەی لە دایکبوونی (نەورۆز)ەوە وتراوە...

لە نۆزدەی هەزار و نۆسەد و حەفتا

نەورۆزی نازدار هاتۆتە دنیا

کاتی هاتنی خێر و شادی بوو

گەورەترین مژدە بۆ ئازادی بوو

سەرەتای خۆشی بەزمی بەهار بوو

دەمی زەمزەمەی یار و دیار بوو

ترس و ناخۆشی کۆچی کرد لە شار

مۆدەی بەسەر چوو ئازار و کوشتار

ئۆخەی سەد ئۆخەی نەورۆزی شیرین

هەر جیلوە دەربی لە گۆڵزاری ژین

***

به بۆنەی لە دایکبوونی (نزار)ەوە وتراوە

سیٚ هەمی ئازار سەرەتای بەهار

هاتە دنیاوە بەخۆشی (نزار)

نۆسەد و حەفتا و دووی زاینی بوو

دوا کۆچی غەم و ماتەمینی بوو

ئاسۆی وڵاتمان سەراپا روون بوو

تاریکی میحنەت سەرەونگون بوو

بە نەغمەی شیرین باڵندەی بەهار

هاتبوونە جۆش لە دەشت و گوڵزار

خودایە ژینی (نزار) باڵاکەی

هەتاکو سەد ساڵ لەگەڵ براکەی

***

به بۆنەی یادی لەدایکبوونی (ژینۆ)وە وتراوە...

هەشتی تشرینی دووهەم بوو بەیان

هاتە دنیاوە ژینۆی نەوجەوان

نۆسەد و حەفتا و نۆی میلادی بوو

سەرەتای ژینی خۆشی و شادی بوو

ئومێدم وایە بەکامەرانی

بژی هەتا سەر بێ سەرگەردانی
ببێ بە غونچەی باخچەی ئازادی
دەرنەچێ هیچ کەس لە بیر و یادی
(ژینۆ) سەرمایەی هەستی شیرینم
یاخوا ناخۆشی ژینت نەبینم

***

پیرۆزبایی لە جیهان علی امین
بەبۆنەی ژن هێنانیەوە
هەرچەندە چویتە ناو قەفەزی زێڕ
ئەم ژینی تازەت پیرۆزبێ بەخێر
لەگەڵ هاوسەرتا جیهان بەشادی
بژین لەدنیای پڕ لە ئازادی
ڕێگای ژیانتان پاك و ڕوناك بێ
زەمان رەوشتی خاوێن و پاك بێ
نیو دەرزەن ڕۆڵەی جگەر گۆشەی جوان
بەرهەمی ژینی خۆشی بێ بۆتان
کارتی شیرینی منت لەبیر کرد
خۆت ڕاوەشێنە ئەمڕۆ دەست و برد

***

## بۆ جگەرگۆشەکانم...

بە زەردەخەنەی شیرینی (شیرین)
بە دەنگی خۆش و زۆر نەرمی (نەرمین)
بە ڕەنگی جوان و پڕشنگی (هەتاو)
لەبیرم ئەچێ تاڵی گیان و ژین
لە ورتە ورتی زۆر خۆشی (تارا)
بە ناز و غەمزەی (دالیای) نازەنین
بە وردی و جوانی (سازان) و (سۆران)
بە جووڵە جووڵی نزاری شیرین
بە بەزمی باڵای زۆر شۆخی (لیلۆس)
روحم ئەگاتە سەر عەرشی بەرین
بە سارد و سڕی دڵسۆزی (فەرهاد)
ناگرمە یادم غەم و کین و قین
ئاواتە خوازم خوا بیپارێزێ
هەتاکو مامە قەت نەبێ غەمگین
خۆشبن (ئاسۆس) و (ئاراس) و (میدیا)
سایەی ئومێدن یاخوا هەر بژین
ئەوانی تریش جگەر گۆشەمن
کە ناو نەبراون لە شیعری رەنگین

***

# ناشرین و بەرگی ڕەنگین

بە بەرگی ئاڵ و والا گیانی ناشرینی داپۆشی
لەلای وابوو بەجاریْ شەربەتی شادی تەواو نۆشی
لەلای وابوو کە ئیتر بونە کۆیلەی ئەو هەموو لاوان
لەدوای چاوی ئەو کەوتوون هەموو یەکسەر بەبیْ هۆشی
بەڵام چاوی عەقڵ بینایە ڕاستی لیْ بزر نابیْ
تەماشاچی، ئەگەرچی هۆشی خۆی ون کا بەسەر خۆشی
***

# شیعر پێویستە

شیعر پێویستە تەڕ و ئاودار بێ
یا چارەسازی دڵی بیمار بێ
شیعر زۆر باشە نەرم و نیان بێ
نەوەك ڕەق وەکو تەلاشە داربێ
شیعر ئەمەوێ دڵ بکاتەوە
وەك غونچەی گوڵی کاتی بەهار بێ
شیعر کە خرۆش نەبەخشێ بە دڵ
قەت باوەڕ مەکە بۆ هیچ بەکار بێ
شیعر کە هەستی تۆ نەجوڵێنێ
با لە دیوانا هەر نادیار بێ
شیعری پڕ مانا و پڕ پێچ و پەنا
لای بە با جێگای پەنا پاسار بێ
شیعر نەتخاتە سەر عەرشی خەیاڵ
مەیخوێنە گیانە با تار و مار بێ
شیعر خاوێن بێ وەك ئاوی ڕەوان
خۆراکی ڕۆحی پاکی دڵدار بێ
***

## شکات لای تۆ بێ

شکات لای تۆ بێ بۆ یەزدانی گەورە
کەوا خولقانت ئەم چەرخ و دەورە
ئەم چەرخ و دەور و سەیر و عەنتیکە
دەماخی زانا تێیدا خەریکە
مرۆڤ و ئەشیاو خولقەت گۆڕاوە
هیچ شتێك لەجێی خۆیا نەماوە
هەموو شت ئێستا پێچەوانەیە
خاوەنی تەلار بەبێ لانەیە
سواڵکەری سەرتون خاوەن تەلارە
گەنجەفە ئەکا بە زێڕ و پارە
سەگ بۆ ئێسقانێ کلکی ئەلەقان
ئێستە گاڵتەی دێ بە گۆشتی بەران
سەر لە جێی پێیە و پێ لە جێی سەرە
گا لە جێی شێر و شێر لە جێی کەرە
دز بۆتە سۆفی، سۆفی بۆتە دز
مامز بۆتە سەگ، سەگ بۆتە مامز
عالم و پیاوی زۆر تێگەیشتوو
بێ نرخ و ناون پەست و دوا کەوتوو
ئەو کەسەی ژیرە یا خانەدانە
یا دەربەدەرە یا بێ نیشانە
***

# ئامۆژگاری باوك بۆ كوڕ

((لە فارسیەوە وەرگیراوە))

باوك: رۆڵە ئاگاداری خۆت بە نەچیە بەزمی بادەوە
نەبیە داوی یاری خۆش و شەنگ و رومەت سادەوە
بێ خەبەر ماوی لە حاڵی ماڵ و منداڵ و خێزان
توش نەبووی هێشتا بەدەس دەرد و غەمی ئەولادەوە
مەسرەفی ماڵت نەكێشاوە و جلت نەدڕاوە قەت
دانەنیشتووی قەت بە كەم دەستی و دڵی ناشادەوە
كوڕ: ئەی بەڕێز باوكی عەزیزم چاكە پەندی تۆ بەلام
گەنجی عەسرم چۆن ئەرێ خۆم پیر بكەم بەم یادەوە
چۆن لە ئێستاوە وەكو ژن دەستە و ئەژنۆ دانیشم
چۆن دڵم ڕاگیر ئەبێ گەر نەچمە بەزمی بادەوە

***

## دەنگ و باسێك لەگەڵ شەیتان دا

له یەزدان ڕەنجام چومه لای شەیتان
وتم: ئەی گەورەی هەموو خراپان
ئەی گەورەی کوێری شومی جرتە بۆز
وا هاتومە لات بم خەیتە ناو هۆز
ئەمە چل ساڵە خەریکی چاکەم
ویستم ئاوازێ بۆخۆم پەیا کەم
ویستم له گەلدا بەرز و بەڕێز بم
له دنیای ژینا توند و بەهێز بم
هەموو سامان و هەست و هێزی خۆم
دانا تا بەری داری ژین بخۆم
کەچی سەراپا رەنجم بەبا چوو
فریشتەی شادی لەڕێما لاچوو
له نەردی ژیان دوو شەشم نەدی
غەیری تاریکی ڕووی ڕەشم نەدی
له جیاتی شنەی بای بەختیاری
دووچاری من بوو کزەی ناچاری
ئینجا ئەی پیشەی چەوت و ناپاکی
له گیانم دەرکە تروسکەی چاکی
تا له پێناوی دروشمی تۆدا
بەختیاری یەك من بکەم پەیدا
شەیتان کەزانی ڕاستە وتارم
به دڵ له چاکە پاکی ی بێزارم

وتی: ئەی ئازیز سا بەخێر هاتی
رزگارت ئەکەم زوو لە نەهاتی
گەر شاگردێکی زۆر چاك و ژیر بی
ناهێڵم هەرگیز پەست و دڵگیر بی
ئەتکەم بە میری وڵاتی نەگبەت
بە خەڵقان بدە خەڵاتی خەفەت
هەرچی کەزانیت راست و بەڕێزە
یاخو خاوەنی سامان و هێزە
بێ زار و زارە ڕەنجەڕۆی ئەکەی
دوو چاری ساختە یا درۆی ئەکەی
لە کەس و کاری زوو ئەڕەنجێنی
خۆشی ژیانی لێ ئەشێوێنی
چاکی و روناکی و پاکی لائەبەی
ئاڵای سەربەرزی سەرنگون ئەکەی
بەڵام گەر هات و لە فەرمانی من
دەرچی ئەتخەمە بەحرێکی بێ بن
وتم: ئەی گەورەی شومی نالەبار
بەراستی هاتووم بمخەرە سەر کار
هەموو فەرمانت بەجێ ئەهێنم
توخمی ناپاکی زۆر چاك ئەچێنم
ئەبمە گەورەتر دوژمنی چاکە
تا ژینم ماوە لەسەر ئەم خاکە

لە شێخ و مەلا و سۆفی دوور ئەبم
بە مەرگی ئەوان من مەسروور ئەبم
بۆ دز و پیاو کوژ کڕنوش ئەکێشم
زیان ئەبەخشم بە خزم و خوێشم
ئەچمە خەرابەی پڕ لە وەیشومە
ئەخەمە دڵی کەسان هەم هەمە
داو ئەنێمەوە بۆ خودا پێداو
هەتا ئەیخەمە حاڵی گیانە لاو
لە گەورە مەردان وا سەر تێك ئەدەم
تا ئەیانخەمە گەرداوی عەدەم
نا کەسان دێنم بۆ گوڵزاری ژین
کەسان ئەخەمە ناو گێژاوی ژین
ڕێ نادەم مەردان بچن بۆ مزگەوت
یا پیاوی خواناس ببینێ سروەت
تا قیم کەرەوە بە لەعنەت کراو ؟
بەجێ ئەهێنم فەرمانت تەواو
چونکە لە چاکە نەمدی بەرهەمێ
دەسگیرم نەبوو پولێ، درهەمێ
لە دنیای چاکە تەواو وەرس بووم
کاس و کەساس و سەرسام و کز بووم
ئینجا شەیتانی شومی بەد چارە
لە نۆکەرێکی خۆی کرد ئیشارە !

وتی: ئەی (فەڕنوس) هەستە زوو بڕۆ
بە ئاوێکی پیس ئەم پیاوە بشۆ
لەشی چەورکە بە پیوی بەراز
هەموو موی لەشی ڕاکێشە بە گاز
شێوەی بگۆڕە نەناسرێتەوە
لەناو وڵاتا بسوڕێتەوە
فیتنە و ئاژاوە و شومی بەرپاکا
لە دەست فریشتەی ڕەحمەت هەراکا
برا بکاتە دوژمنی برا...
باوك بەقڕدا بە دەستی کوڕا
بەینی دایك و کچ وەها تێك بدا
کە لە یەکتریان باش بکا (جودا)
ئاڵۆزی ژیان بخاتە ناو گەل
بۆ کەس نەهێڵێ تروسکەی ئەمەل
گەر هات و دەرچوو لەم تەجروبانە
ئەوسا چاکترین ڕۆڵەی خۆمانە
ئەوکاتە لەووی ئەم پەند و بەندە
لەپاش ئەم کارە زۆر ناپەسەندە
سەراپا گۆڕا ڕەنگ و سروشتم
لە پیشەی شەیتان باش تێگەیشتم
ویستم کاری نوێ تاقی بکەمەوە
مرۆڤایەتی لێم دوور خەمەوە

چومە کڵێشەی پیاوێکی خواناس
کە تەڵاق بدا خێزانی کەساس
ژیانی ماڵی بکا بە ئاگر
دوور کەوێتەوە لە خودای نەمر
بەڵام هەرچەندە کەوا تێکۆشام
هەروەکو شەیتان بەم کارە هەستام
رەنجم بەبا چوو هیچ سەرنەکەوتم
لە خەراباتی سەغڵەتا خەوتم
مەردی خواناس گەلێ لە جاران
چاکتر دڵشادی خستە ناو خێزان
خۆشی روی کردە ژن و منالێ
بەرگی ماتەمی لەژین داماڵی
تەنیا روو رەشی بۆمن مایەوە
ناحەز بەم حاڵەی من حەسایەوە
ئینجا چومە لای پیاوێکی نامەرد
جرتە بۆزێکی بەهێز و نەبەرد
بە قسەی نەرم و خۆش و خەندەوە
ویستم بیخەمە ناو گۆبەندەوە
یاخود لەرێ و بان دەسکە بە تاڵان
گوێ مەدە ناڵەی ژن و مناڵان
هەرچی هاتە رێت بیکوژە خێرا
خۆت نزیك مەخە لەکاری خێرا

مندالْ لەکۆشی دایك دەربێنە
دڵی بە پشکۆی غەم بسوتێنە
ئاگر بەر بدە لە دەغلْ و خەرمان
ژیان لە فەلاح هەربکە بە ژان
لەم قسانەی من کابرا گرژ بوو
وەك ئەسپی سەرکێش لە جڵەو دەرچوو
وتی: ئەی خوێڕی شاگردی شەیتان
ئەتەویْ ئاوا دەستم کەویْ نان
ئەتەویْ ملم بکەی بە دارا
ببم بە عیبرەت لە گوند و شارا
بڕۆ دورکەوە بەوکاری بەد خوو
هەتا نەتکوژم، ئەی بیْ ئابڕوو
عەرەبانەکەت خێرا راکێشە
بڕۆ بۆ چیا و جەنگەڵ و بێشە
ئینجا چومە لای لاوێکی زەنگین
گەنجێکی بۆشناخ رەنگ و خوو شیرین
دیم دانیشتبوو بیْ دەنگ و سەرسام
وتم ئەی لاوی خاوەن هۆش و فام
بۆچی وا ماتی لەچی دڵگیری
دیارە بە داوی عەشق ئەسیری
خۆتۆ خاوەنی سامان و پارەی
بە پارە ئەکریْ هەر کاریْ چارەی
باوکت خاوەنی ملیۆن دینارە

خاوەنی باغ و کۆشك و تەلارە

تۆ لاوی مەیلت لە عەیش و نۆشە

ژیانی بێ ژان ئێستاکە خۆشە

بچۆ سەر قاسە پارە دەربێنە

چیت ئەوێ بیکە دڵت مەشکێنە

بەڕاست و چەپا فڕێیدە پارە

گەر بۆ تیا ترۆیە یا بۆ قومارە

سامانی باوکت ئەوەندە زۆرە

قەت تەواو نابێ هەرگیز بەم جۆرە

عەیبە دانیشی وەها بە پەستی

بژی بە شادی، یاخو بە مەستی

لاو قینی هەستا لە وتاری من

لەم کارە نەبوو بە هاوکاری من

وتی: ئەی پەستی خانی نالەبار

ئەتەوێ ببمە پەندی رۆژگار

من چۆن لە دنیای چاکە دەرئەچم ؟

بۆ ناو گەلداری بەدناوی ئەچم

لە ڕێگەی هەستی بەرز و بەنەرخا

ژیان سەرف ئەکەم لە دەور و چەرخا

برۆ خۆت لادە دوورکەوە لەمن

بچۆرە خزمەت شەیتانی مەزن

بڵێ لەم ڕێگە من سەرناکەوم

لە فریو دانا قەت دەرناکەوم

ئەم قسە تیر بوو کە دای لە جەرگم
ئاواتە خوازی هاتنی مەرگم
زانیم کەس بەمن فریو نادرێ
کاری شەیتانی بەمن ناکرێ
بۆ نالەباری من نەخولقاوم
هەرچەند هەژار و غەمگین ژیاوم
هەموو خراپی دوورە لە پیشەم
ئەم جۆرە کارە دەردێنێ ریشەم
با دوور کەومەوە لە شەیتانی شوم
بۆ هاوکاری ئەو نیە ئارەزووم
ئەگەڕێمەوە بۆ دنیای ڕوناك
ئەبمە هاودەمی مرۆڤانی چاك
پڕۆ پاگەندە ئەکەم بۆ چاکی
لا ئەدەم لە ڕێی چەوت و ناپاکی
گیانم بەخت ئەکەم بۆ هاو وڵاتم
هەتا دێتە دی هەموو ئاواتم
تۆبەی ڕاست و حەق ئەکەم بۆ یەزدان
سەد هەزار لەعنەت ئەکەم لە شەیتان
***

## لە زمانی چەند لاوێکی (مۆدێرن)ەوە

لە ساڵی ١٩٥٠ وتراوە....

پێم ئەڵێن لاوی خاوەن هیمەت بە
صاحێب مەبدەئو جوانی ی سیرەت بە
وەك شێر بۆ قەومت تۆ بە هەڵمەت بە
بە عەزم و حەزم و ئیستقامەت بە
بەڵام ئەمانە لای من وەك بایە
خۆشتر لەم قسە لای من زوڕنایە
تەوالێتەکەم ڕۆنم لێداوە
باق و بریقەی ئافەتی چاوە
جلەکەم ئوتوی باش لێدراوە
قۆندەرەکانم بۆیاخ کراوە
ئیتر کوردی چی کوردستانی چی ؟
عەزم و هیمەت و هەوڵدانی چی ؟
یاخەی کراسم ترازاندووە
سینەی وەك زیوم جوان نواندووە
نرخی مەڕ مەڕم پیٚ شکاندووە
زۆر پیاوی گەنجم فریواندووە
ئیتر قەومیەت قسەی بەلاشە
لەو کارە لادەن ئەم کارە باشە
بەیانیان درەنگ هەڵ ئەسم لە خەو
چونکە من نانووم هەتا نیوە شەو
لە نۆشا نۆشام لەگەڵ ئەم و ئەو
قاسپە قاسپمە هەردەم وەکو کەو
ئیتر شعوری پاك و ڕۆحی بەرز
شتێکن وەکو باوێشك و وەنەوز

من قەت دڵێ خۆم ناکەم موکەددەر
جل و تەوالێت ئەکەم موعەتتەر
ئەچمە نزیکی دوکانی کەسپەر
لەوێ هەر کچێ کە ئەکا تێپەڕ
بە زەردەخەنە و بە غەمزە و بەناز
دڵی ناسکی ئەخەمە پەرواز
ئەڵێم موغەننی وەرە دەی بۆلام
توخوا بۆم بڵێ لە بەستە و مەقام
ئەیڵێ زۆر بە جۆش نەك بێ تین و خام
ئاخ سەد خۆزگە تۆش یاری دلارام
ئێستا لام ئەبووی بە عەیش و بە نۆش
ژیانی تاڵمان ئەکرد فەرامۆش
ئازایی لەلام دانس و سەمایە
غیرەت و هیممەت بەستە و غینایە
عەقڵ و دوور بینی لام سینەمایە
باسی نەجابەت نەکەن خەتایە
نەجیب کەسێکە پارەی زۆری بێ
ئەگەرچی عەقڵی پوچ و قۆڕی بێ
مەعنای ژیانی لاوی وەهایە
لاوێ وانەبێ لام بێ بەهایە
بۆ ژیان ئەبا ڕێی مونتەهایە
هەرچی لێی دەرچێ وەحشی چیایە
وەرن لاوەکان بکەن پەیڕەوی
ئالای شادیتان قەت مەکەن نەوی
***

##ماڵی دنیا

یەزدان کەماڵی پێدای
دەستی رەحمەتی لێنای
خۆش رابوێرە بیخۆ
گەر مەرد و ژیر و وریای
***

## شەیتان

شەیتان ئەڵێن لەعینە
یاری ئاشوب و قینە
لە چاو گەلێ هاودەما
وەك فریشتەی زەمینە
***

## مەترسە

سەگ، پێت وەڕی مەترسە
بەردێکی بۆ فڕێ دە
گەر کەر زەڕی مەپرسە
هێواش دارێکی لێدە
***

## رەوشتی جوان

ئەوەی رەوشتی جوانە
پرشنگی نیشتیمانە
بەڕێز و خۆشەویستە
ئارامی رۆح و گیانە

## ناکەس

ناکەس بە دەنکە جۆیە
گەر نەزەرێ درۆیە
ئەوەی کەسە بەسامان
ناگۆڕی چەشنی خۆیە

***

## بێ بەخت

ئەوەی کە بەختی ڕەشە
لەماڵی خۆی بێ بەشە
ئەمرێ بێ ناو و نیشان
وەك کوڕەزاکەی قەشە

***

## رووشکێن

کەسێ کە روو شکێنە
قەت وازی لێمەهێنە
لە کۆمەڵا بە توندی
وەك شوشە بیشکێنە

***

## باغ و چیمەن

گوڵزار و باغ و چیمەن
خۆشتر نزار و دیمەن
کاتێ شادی ئەبەخشێ
کەوا ئازادبێ وەتەن

## بەرگی حەیا

هەر کەسێ هات و دڕیا
بەرگی حەیا لەبەریا
هەرچی خراپە ئەیکا
هەرکاتێ هات بەسەریا

***

## منالی نالەبار

تێك ئەشکێنێ کارت
منالی نالەبارت
موشکیلە پەیدا ئەکا
خوێن و دڵ و دەمارت

***

## تکا لە ناکەس

تکا مەکە لە ناکەس
بمری ئەگەر لە برسا
دەست مەدە دەستی بێدەس
گەر زیرەکەی لە ترسا

***

## وەجاخ کوێر...

ئەگەر کوێر بوو وەجاخت
بەرهەمی نەبوو باخت
لە دەشتی ئازادی یا
تاوی بدە وڵاخت

## سیاسەت

هەتا ماوە هەناسەت

مەچۆ نزیك سیاسەت

ئازار و رەنج و ژانە

مەکە بۆ ئەوە تاسەت

***

## ئایین

ئایین شتێکی بەرزە

رێزی بگیرێ فەرزە

ئەوەی کە لێی دورکەوێ

ناوی ئەبرێ بە هەرزە

***

## چاکە

چاکە بکە بەو کەسە

کە هەژار و کەم دەسە

نەك بە مەردی نابەکار

بە زۆریش نالێ بەسە

***

## هاودەمی

زۆر چاترە گورگی هار

لە هاودەمی نالەبار

کە خۆت لێ ئەپارێزی

لە ژاری ئەم نیتە چار

## حاڵ و ماڵ

به حاڵ و ماڵ و بونت
خۆشه دڵ و دەرونت
بۆ گەل کە نەت بوو چاکە
بێ سودە هات و چوونت
***

## شەڕ فرۆش

ئەوەی کە شەڕ فرۆشە
لە دەماغا نەخۆشە
خۆی لێ دوور ئەخاتەوە
هەرچی خاوەنی هۆشە
***

## رێگای ئومێد

رێگای ئومێد کە سەختە
بەرد و دار و درەختە
بەڵام کە هات و بڕیت
پێشوازی کەرت بەختە
***

## بەرگە فریشتە

ئەگەر بەرگی فریشتەی خوا لەبەر کەی
کڵاوی قوتبی رەببانی لەسەر کەی
وەلێ گەر کەوتیتە ناو قەومی ناپاك
ئەبێ خێرا سەری خۆت وا بەدەر بکەی

## چارەی بەدکار

نەلوقمان و نە سوقرات و ئەرەستوو
نە قورئان و نە دەرمان و نە جادوو
چ ناکەن چاری ژاری نالەباری
بەتەنها مەرگە چاری ماری بەدخوو

***

## دروشمی هیوا

وا بەسەر لوتکەی کێوی هیواوە
دروشمێکی جوان هەڵواسراوە...
هەرچی لەم کەژە قاچی هەڵخزا
ئەڕواتە بنکی دەریای بەڵاوە

***

## دەستی نامەردان

زانیت خنکاوی لەناو دەریادا
هیچ کەس لە کەسان یاریدەت نادا
دەستت مەدەرە دەستی نامەردان
گەرچی گیانیشت وا لە فەنادا

***

## نەوەی سواڵکەر

گەر نەوەی سواڵکەر ببێ بە سەردار
هەستی هەر پەستە کاری نالەبار
پارە سروشتی مرۆڤ ناگۆڕێ
شیرینی نایکا چارەی ژەهری مار

## مەلەوانی

مەلەت زانی مەچۆ گویٚ روبار
گەر، چویشی مەچۆ نزیك و کەنار
گەر لەسەر لمی روبار هەڵخزای
فریات ناکەویٚ گریان و هاوار

***

## سرِی خۆت

سرِی خۆت بدە بەدەم هەواوە
چاکتر و باشتر پارێزراوە...
لەوەی ئەو سرِە بدەیتە دەس ژن
زوو بۆت ئەخاتە ناو سینەماوە

***

## پیاوی نۆکیسە

نەکەی کە نەت ما سەروەت و سامان
بچیە لای پیاوی نۆکیسەی نەزان
لەگەڵ ئەوەشا فریات ناکەویٚ
بە قسەی بەلاش ئەتخاتە گریان

***

## کرداری هاودەم

ئەگەر چاك نەبوو کرداری هاودەم
هیچ مەی دوێنە نە زۆر، نە کەم
بیٚ دەنگی چاتر وەڵامی پیاوە
لە ئاڵۆزی ژین ئەبی خاتر جەم

## ژیانی خراپی

ئەگەر لەسەربان تولەیەك وەڕی
یا خو لە کۆڵان جاشکێ زەڕی
زیانی نیە بۆکەس بەقەدەر
پیشەی خراپی پیاوی سەر سەری
***

## ژیانی شادی

هەرچی کە ویستی بژی بە شادی
پێویستە هەڵکا چرای ئازادی
چارەکا زام و دەردی هەژاری
ڕۆژی رابردوو دەرکا لە یادی
***

## ئومێدی ژین

ئومێدی ژین شتێکی بێ سنووره
بەقەد ئاسۆی ولاتی بەرز و دووره
کەسێ ئومێدی مەحدود و نزم بوو
هیچە گەر خاوەنی هەشتا کلووره
***

## باوکت

باوکت کۆچی کرد دەرچوو لە دنیا
لە عومری خۆیا بە شادی ژیا
لەگەڵ عالەما باش و روو خۆش بوو
لە خۆشی ئەولاش بووە دڵنیا...

## هاشه و هووشه

ئەوەی هاشەی کرد یا خۆی هەڵکێشا
هیچ فەرقی مەکە تۆ لەگەڵ مێشا
ئەویش وەکو مێش پیس و بێ نرخە
هەر گیزەی هەیە لەپاش و پێشا
***

## خۆ هەڵکێش

ئەوەی نەفام و پەست و ناژیرە
ئەڵێ فامیلیام گەورە و ئەمیرە
چونکە خۆی هیچ و لە هیچ کەمترە
سەرمایەی دەستی بوك و باپیرە
***

## درۆزن

درۆزن وتی: بەزۆری بازوو
رۆستەم ئەخەمە ژێر تای تەرازوو
بەم جۆرە کەسە دەسخەرۆ نەبی
لێ یان دوورکەوی چاکە زوو بە زوو
***

## تەفرە نەخۆی

بە قسەی چەور و نەرمی هەندێ کەس
هەستی بەرزی خۆت تۆ نەدەی لە دەس
گەر تەفرە بخۆی کاتێ ئەزانی
نەگبەت بەسەرتا دێ وەکو هەرەس

## گەردەلوولی هەژاری

لەدەس رەشەبای توندی ئەم شارە
خەریکی کەخۆت بکەی ئاوارە
ئەی گەرد و لوولی توندی هەژاری
پێم بڵێ ئاخۆ چۆن ئەکەی چارە
***

## هاوده‌می چاکان

دەست بدە دەستی پاکی پیاوی چاك
رزگارت ئەکا لەرێ ی ترسناك
نیشانت ئەدا ئاسۆی دڵشادی
دەستگیرت ئەکا ژیانێکی پاك
***

## بێ بەهرە

ئەو کە هیچی نیە لە بارا
یا پەست و سستە لە ئیش و کارا
بارێکی قورسە لەسەر گیانی گەل
رۆژی هەر رەشە لە رۆژگارا
***

## یارمەتی

ئەوەی کە گەردوون داماوی ئەکا
تووشی وەی شومە و گێژاوی ئەکا
ئەگەر ئەتوانی یارمەتی بدە...
تا چاری ژینی شێواوی ئەکا

## سلاوی ناکەس

سلاوی ناکەس بسێنرێتەوە
درك لە رێتا ئەچێنرێتەوە
چاکە لە نامەرد نابێ دەستگیرت
لە سایەی خەما ئەمێنیتەوە

***

## کەس و بێگانە

ئەڵێن چاکترە کەس لە بێگانە
لە کاتی دەرد و ڕەنج و تەنگانە
بەلام داخەکەم گەلێ کەس و کار
ئەکەونە گیانت وەکو مۆرانە

***

## نەگبەتی

ئەگەر نەگبەتی بوو بە هاودەمت
کەس نیە بێتە هاو ڕازی غەمت
ئەوەی لە ڕۆژی بونا یارت بوو
ئەبێ بە تەمی کەژی ماتەمت

***

## وڵات فرۆش

ئەوەی بۆ پارە ولاتی فرۆشت
ئەمڕۆ روو رەشە پەنجەی خۆی کرۆشت
نان و دۆیەکی خاوێن بەشەرەف
گەلێ خۆشترە لە پلاو و گۆشت

## دیواری دوشمن

لەژێر سێبەری دیواری دوشمن
ناحەسێنەوە بچوك و مەزن
مەگەر ئەو کەسەی کە نەفسی پەستە
هەر خۆفرۆشە تا کاتی مردن

***

## سەرم سوورماوە

سەرم سوورماوە من لە هەستی خۆم
بۆچی بۆ کەمی سامان غەم بخۆم
پێویستە لەخۆم لات و هەژارتر
تەماشا بکەم ئەوسا رێك بڕۆم

***

## بەرزی نەفس

((لە عەرەبیەوە وەرگێراوە))
تەعامیّ هات و مێشی تیّ وورووکا
دەنی تەبعم کە نەفسم اشتهای کا
بڵند و بەرزە نەفسم وەك دەماوەند
کە هەرگیز ئارەزووی بەرماوە ناکا

***

## بەهرەدار

لە چیرۆکی بەدبەختیا
ناوم نراوە بەختیار
لە ژیانێکی سەختیا
وا پێم ئەفەرموون بەهرەدار

***

## قارەمانی گەل

سەیرە بەزمە سینەمایە
ئەم خەڵقە بۆچی وەهایە
ئەیکەن بە قارەمانی گەل
ئەوەی هیچی لەدەست نایە

***

## بۆ پێکەنین

بۆ گاڵتە و گەپ و پێکەنین
گەلێ مرۆڤ کەوا ئەژین
بۆ دەمێکی ڕابواردن
شادی لەتۆ ئەکەن بە شین

***

## خاوەنی هەست

هەرچی کەخاوەنی هەستە
خۆشی من و تۆی مەبەستە
ئەوەش کە ئەمان ڕەنجێنێ
مرۆڤێکی پیشە پەستە

## بە خەندەوە

گەرەکتە هەر بە خەندەوە
دەستم بخەیتە بەندەوە
بڕۆ برا لێم دورکەوە
نایەمە ناو گۆبەندەوە

***

## یانەی وێران

من لە یانەی وێرانەما
ئەوەی پێم ئەوێرا نەما
ئەویش تروسکەی ئەمەل بوو
چوو بۆ عالەمی سینەما

***

## نانە رەق

هەر بۆ دوو پاروو نانە رەق
لە دەستم چوو قەواڵەی حەق
هێزم نیە شوێنی کەوم
نەوەك ببمە دوچاری شەق

***

## ئەوەستا

ماموٚستاکەی کە ئەوەستا
لەبەر دوکانەکەی (وەستا)
پەندی باشی ئەخوێندەوە
دیم کە بەسەر خۆشی ئێستا

## چەن دیناریٚ

((لە ژیانمدا ئەم کارەساتە رووی داوە))

پارەم هەبوو چەند دیناریٚ
دامنا لەلای بەختیاریٚ
کەچووم داوام لیٚکردەوە
کابرا لیٚم بوو بە رەشماریٚ

***

## حەق سیٚن

وتم خودای حەق حەق سیٚنە
ئاگای لە رازی نهیٚنە
هەتا ماوی ناحەق مەبە
مایەی شەرەف مەدۆڕیٚنە

***

## مووچە

ئەوەی میری کە ئەمداتیٚ بە مووچە
بەشی سیٚ نان و دوو کالیاری پووچە
گەرەکمە سەرکەوم بۆ پایە بەرزی
بەلاّم سەرناکەوم ئەو پایە قووچە

***

## لەژێر سێبەری

لەژێر سێبەری پیاوی بە سامان

ناژیم گەر هەتاو بم کا پەرێشان

سەرم شۆڕ ناکەم بۆ موچە و خەڵات

بۆ کاسەلێسی ناچمە دیوەخان

***

## ئەچەوسێمەوە

ئەمە چل ساڵە ئەچەوسێمەوە

وتم با چل ڕۆژ بحەسێمەوە

کەچی بەختی بەد فەرمانی پێدام

بۆ ڕێگای زەحمەت بگەڕێمەوە

***

## گریان

گریان بەرهەمی دڵشکاوی یە

ماتەم خەڵاتی ناتەواوی یە

ژانی ژیان و دەردی نەبوونی

لەگەڵ مردنا ڕێك مساوی یە

***

## کەژی ئاوات

ئەتەوێ بچیە سەر کەژی ئاوات

ببڕە ڕێبازی پڕ هات و نەهات

ئەوسا سەرکەوە بە دار و بەردا

لەسەر کەل یاری ئەمەل دێتە لات

## قسەی کەسان

به قسەی کەسان دەست نادەم لە دەست
قەت تەفرە ناخۆم بە ماستاوی خەست
لە خشتەم نابا قسەی چەور و نەرم
ئەڕۆم لە ژینا بە فرمانی هەست
***

## ماندوو

بەجارێ مێشك و گوێم بونە ماندوو
لە واتەی هیچ و بێ کەڵکی نەزاندوو
خودا سا تۆ بڕەخسێنی بە زوویی
لە گوڵزارا نەمامی شادی چاندوو
***

## درشتی

ئەوانەی وا لەگەڵ خەڵگا درشتن
لە ژینا نا تەواون وەك بڕشتن
هەتا ماون کە قەد ناڕۆن بەرەو پێش
تەبیعەت پەستن و دایم لە پشتن
***

## شوێنی پێویستی

لەسەر هەر رێ یە رۆیشتی
ئەگەیتە شوێنی پێویستی
لەسەر هەر کارێ چاپوك بی
بەکاری تۆ ئەبێ گشتی

## لە فارسیەوە(١)

### بەهەشتی فرۆشت

ئادەم بە هەشتی بە گەنم فرۆشت
ناکەسم گەر من بەجۆ نەی فرۆشم
بەهەشت گەر هەبێ من قەت نایگەمێ
بۆ دوور لە ئاوات من غەم بنۆشم

***

### بەختی بەد

ئارەزووم وابوو کەوا لەم ژینەدا ئاسودە بم
دوور لە ئازار و هەژاری و کردەوەی بێهوودە بم
داخەکەم ئاواتەکەم گشتی بە عەکسی هاتە دی
بەختی بەد ویستی هەتا ماوم بە غەم ئالوودە بم

***

### ماڵی خۆت

ماڵی خۆت ناچێ بەدەمتا بۆتە تەوقی گەردنت
مردوەکان زیندوو ئەکەی هەی ئافەرین بۆ مردنت
ئەوکەسەی دەستی بقوچێنێ لە بۆ خۆشی ژیان
لائیقە بۆ ئەو کەسە ئەی کاکە لەعنەت کردنت

(١) ئەم دوو بەیتە هی حافزی شیرازییە لە فارسیەوە وەرگیراوە.

# باسی ژیانم بە کورتی

ژیـانی مـن کـە ئێـستا لـە تەمـەنی ٦٥ سـالّیدام لەسـەرەتای لەدایکبوونمـەوە هـەتا ئـەمڕۆ بەشێوەیەکی سادە تێپـەڕیووەو لـەماوەی ژیانما هیچ کارێکی گرنگو سەرنجڕاکێش ڕووینەداوە هەتا بە پێویستی بـزانم کـەلێی بـد ویـم، هەرچـەندە دووچـاری هەنـدێ ناخۆشـیی و کەشمەکەشـی ژیـان بـووم و تـالاّوی هـەژاریی و دەربـەدەرییم نۆشـیووە بـەلاّم نوسین و لێـدوان لەبارەیـەوە لـەلام نرخێکـی ئـەوتۆی نییـە. ئینجا بەکوورتی و بە راستی لە ژینی خۆم ئەدوێم:

١- ناوم علی کوڕی عارف أغا کوڕی عزیز أغا لە بنەماڵەی (ئاغا تـەها) م کەلە شاری سلێمانیدا ناو بانگێکیان هەیە. لە ساڵی ١٩١٠ ی زایینـی لەشاری سلێمانی لە گەڕەکی دەرگەزێن لە دایکبووم. سەرەتای خوێندنم لە قوتابخانەی خواجە ئەفەندی بوو کەلەو دەمەدا چوونە قوتابخانـەی میری زۆر باوی نـەبوو، لـەو قوتابخانەیـە قورئـانی پـیرۆزم تـەواو کـردو گوڵـستانی سـەعدی و ئیسماعیل نامـەم خوێنـد، بـەم هۆیـەوە لـەزمانی فارسییدا هەنـدێ شـارەزاییم پەیـدا کـرد. لـە سـاڵی ١٩٢٠ کـە زەمـانی ئیحتیلالی ئینگلیزیی بوو و لە دواییدا بوو بە حکومەتی شێخ مەحمودی گـەورە چـوومە قوتابخانـەی سـەرەتایی میریـی و لـە دوای تاقیکردنەوەیەکی کـەم لـە پـۆلی دووەم وەرگیرام و لـەم دەمـەدا بـەکوردی ئەمان خوێند، لەپاش دوو ساڵ بە تـەواویی فێری نووسین و خوێندنی کـوردی بـووم. مـن هـەر لـەم ماوەیـەدا زۆر مـەیل و ئـارەزووی موتـالاّو خوێندنـەوەی شـیعری شـاعیرە بەناوبانگـەکانم هـەبوو وەك: (نـالی، مەولـەوی، کـوردی، سـالم، شـێخ رەزای تالـەبانی و مـەحوی). لـە هـەر

جێگایەك لەلای هەرکەسێك بمزانیایە شیعری کوردی لا هەیە ئەچووم پەیدام ئەکرد و ئەمنووسییەوە، بەم جۆرە کەشکۆڵێکی ئەشعاری گەورەم پێکهێنا کە شیعری سەد شاعیری تیا نووسراوە. لەو شاعیرانە کە ئێستا ناوەکانیانم لەبیر ماوە ئەمانەن:( نالی، کوردی، هیجری، مەولەوی، خاکی، سالم، مەحوی،شێخ رەزا، کەیفی، فیکری، خەستە، بیمار، حریق، صابری،فائق (مەلا وەسمان باوکی حاجی مەلا عەلی گەورە)،وەفایی، ئەختەر، زەلیل، ئەحمەدی کوڕ، مصباح الدیوان، وەلی دێوانە،حەمە ئاغای دەربەند فەقەرە، ئەحمەد بەگی کۆماسی،تایەر بەگی جاف، ئەحمەد موختار جاف، ناری مەریوانی، صافی هیرانی) و گەلێ شاعیری تر کە ناویانم لەبیر نەماوە.

٢-لەشاعیرە بەناوبانگە کوردەکان لە شوعەرای کۆن و تازە کە زۆر دڵبەند (معجب) بووم بە اشعارو ئەدەبیان ئەمانەن: (نالی، کوردی، سالم، شێخ رەزا، مەولەوی، تایەر بەگ، زێوەر، بێکەس، گۆران، هەردی، سەلام و دڵزار).

٣-هەر لەیەکەم پلەی لاوییدا مەیل و ئارەزووی شیعر دانانم کەوتە مێشکەوە، شیعرەکانم پیشانی مامۆستا زێوەر، بێکەس یا بەختیار زێوەر ئەدا ئەگەر ئەوان پەسەندیان بکردایە ئەوا لەدەفتەرێکدا ئەمنووسییەوە و ئەگەر ناپەسەند بوایە ئەم دڕاند.

٤- لە خوێندندا هەتا پلەی ناوەندی (متوسیتە)م تەواو کردووە. لەساڵی ١٩٣٣ لە دادگای سلێمانیدا کرام بەنووسەر و لە چەند فەرمانگەیەکی تری میریدا وەزیفەی نووسەری و سەرنووسەریی و مەئموریم کردووە. لەساڵی ١٩٥٥ خانەنشین کرام.

٥-زۆربەداخەوەم کە ئاشنایی و سەرو سەودام لەگەڵ جۆری ئەدەبی (روانگە) دا نییە چونکە ئەو جۆرە شیعرو ئەدەبە پەیوەندی نییە بە کێشانە (وزن) و قافیەو ئوصولْ و قاعیدەی عروزەوە.

٦-ئەو شیعرانەی کەنووسیومنەتەوە بەشی زۆری دڵداریی، کۆمەڵایەتیی، نیشتمانیی و هەندێ جۆری ترن.هیچ بەتەنگەوە نییم کە رەخنەم لێ بگرن و پێم بڵێن شاعیرە، شاعیر نییە، هەرزە یا پیرە چونکە ئەم شیعرانە هەستی خۆمن خستوومنەتە سەر کاغەز ئینجا لێدوان یا لێنەدوان لێیان، پەسەندکردن و پەسەندنەکردنییان شتێکی ئەوتۆ نییە کە سەرم گران بکات یا بمخاتە بیابانی خەیاڵاتەوە.

١٥ ی ئابی / ١٩٧٥

علی عارف ئاغا

# ئاوێنە

شووشە یا ئاوێنەیە یار کوڵمە سافولووسەکەی
هەروەکو ڕێحانە جوانە قاقەزە دەسنووسەکەی
چوومە لای پاڕامەوە ئاگای لە حاڵی من هەبێ
ئاگاداربوو لەم تکایەم دایکە وەك جاسوسەکەی
پرسیاری چەن شتم لێ کرد لە زانست و هونەر
زوو دەری هێنا بە وردی لاپەڕەی قاموسەکەی
ئەو (قەشە) ی هاوڕازی یارە ژیرو زانا زیرەکە
پێی بڵێن با بەس بەتوندی لێبدا ناقووسەکەی
سەیری خاڵی روومەتی یارم ئەکرد کاتێ بەیان
چەند جنێوێکی بەمن دا خاڵە بێناموسەکەی

١٩٧٩/٩/١٢

***

# ماچی روخسار

ئەو یارە چاوجوانە ماچی روخساری دامێ
لەباخی جوانی سینەی جوتێ هەناری دامێ
گەرچی باران و بەفرە، ئەبارێ قەترە قەترە
بەکوڵم و سنگ و لێوی مژدەی بەهاری دامێ
ئەمشەو لەکاتی مەستی، پیاڵەی گرتە دەستی
چونکە بالأیە هەستی، نەشەی خوماری دامێ
گەڕام زۆر بەنیهانی، بۆ بادەی کامەرانی
بەلأم پزیشکی نەفام، هات ژاری ماری دامێ
هەموو ئومێدی ژیان،کەدوور بم لە دەردو لە ژان
یەزدانی چەرخ و زەمان، وەسڵی نیگاری دامێ
***

# ئومێدی هاتن

گیانەکەم ئاخۆ تۆدێیتـــەلام ؟ کەی کەی کەی
بـڕیـارت داوە ؟ منیـــش بەتەمام دەی دەی دەی
فەرموت کەهاتم تۆ چـــی نۆش ئەکەی ؟ مەی مەی مەی
ئەگەر خوا بیکا ئـەگـەم بـە مـەرام هەی هەی هەی
ئەو شتەی هـەسـتـم باش ئەجوڵێنێ نەی نەی نەی
ئەگینـا ئـەژیـم پـەسـت و بێ ئـارام وەی وەی وەی
ئـەوەی ئەشـوبهێ بە نـەمـامی تۆ بڕوام پێ ئەکەی
سـەرنـجـم داوەو گـەلێ دڵنـیـام بەی بەی بەی
گەرچی دەروێـــش نیم هەر تۆ رابەرمی کە لێم تێك نەدەی
هـەر هـاوار ئـەکـەم بەم جۆرە بەڵام حەی حەی حەی

٢٩ / ١٩٧٩/٩

***

## لە تاریکی شەوا

لە تاریکی شەوا رووی تۆ ئەبینم
بە جاریٚ روون ئەکەی رِیٚبازی ژینم
دڵم خۆشە لە سایەی جوانی تۆدا
لەگوڵزارا خەریکی گوڵ چنینم
دەرودەشت و چیا لا وەك بەهەشتە
کە وا ئەڕوا بەسەریا نازەنیم
نییە کارم بەدەرمانی پزیشکان
کەماچی دەم ئەکا چارەی برینم
نییە باکم لەتانەو تیری ناحەز
لەگەڵ هیٚزی ئەوینا زۆر بەتینم
وەرن یاران بە رِیٚگەی راستی عەشقا
هەمووتان بێنە سەر رِیٚبازی دینم
***

# ئومێدی دڵشادی

ئارامی گیانم سەعات نۆی بەیان
ئۆغری فەرموو بۆ بەزم و سەیران
دڵی لێسەندم بردی لەگەڵ خۆی
رۆحیشم لەگەڵ دڵ پێشکەش ئەکەم بۆی
ڕۆح و دڵ و گیان هەر بۆ ئەو باشە
ئەگینا هەمووی پوچ و بەلاشە
سەرچاوەی ژیان بێ ئارامی گیان
هیچ خۆشی نابێ بێجگە لە ژیان
گێژو سەرسام و پەست و دەبەنگم
کە ئەو لێم دوورە زەرد ئەبێ ڕەنگم
ڕەنگە نەزانێ کە شەیدای ئەوم
کوژراوی دیدەی وەك شەهلای ئەوم
ڕەنگە نەزانێ تل ئەدەم بە شەو
کەئەو لێم دوورە لێم حەرامە خەو
هەر لەیەکەم ڕۆژ کە ڕوویم دیوە
عەشقی لەگۆشەی دڵم چەسپیوە
عەشقی وەك ئاگر ئەتەنێتەوە
بە ئاوی ڕووبار ناکوژێتەوە
کاتێ بەلەنجە کە دێت و دەڕوا
بەخوای جوانی باش ئەکەم بڕوا

کەلەتەك منا دێتە گفتوگۆ
ڕۆحم لەعەرشا ئەکا هاتوچۆ
ئەگەر بۆ خەندەش دەم بکاتەوە
دڵ و دەرونم ڕوون ئەکاتەوە
گەر خوا نەکەردە لەمن دڵگیر بێ
خوایە دڵی من لەت لەتی شیر بێ
خوایە ئەم گیانەم قەت لێم نەڕەنجێ
چونکە چاکترە لای من لە گەنجێ
سەرۆکی جوانی هەموو دونیایە
نموونەی کاری بەرزی خودایە
ئەگەر لێم ڕەنجا بێگومان ئەمرم
چونکە من بەرگەی خەمی ناگرم
ئەم شیعرە شوعلەی ڕوونی هەستمە
ئاوازی ڕۆحەو زۆر مەبەستمە

١٩٧٩/١٠/١٦
***

## جارێکی تر

ئەو دڵەی ڕەنجاوە لێت ڕاوناکرێ جارێکی تر
ئەو سەرەی فەوتاوە بۆت داوناکرێ جارێکی تر
ڕیسی بەدبەختی کە ڕستم تانوو بۆی زۆر قایمە
خۆتی بۆ ماندوو مەکە خاو ناکرێ جارێکی تر
ئەو کەسەی سووتا وەکو من وا لەڕێی دڵداریا
ناوی بێ ناو ماوە بەدناو ناکرێ جارێکی تر
یار کەوا بەرق و بروسکەی کوڵم و چاوی کوشتمی
گیانی من ئاڵوودە بوو چار ناکرێ جارێکی تر
من لە ناو چۆڵی غەما وا داو بەشم خنکاوییە
چاری خنکاویی بەسەد ئاو ناکرێ جارێکی تر

١٩٧٩/١٠/٢٥

***

## تێپەڕە

یار وتی: مـن جـوان و تـۆ پیر و هـەژاری تێپەڕە
مـن گوڵی باغی ژیان تۆ کۆلکەداری تێپەڕە
من وتم: قوربانـە وا قوربان بە قوربانت ئەبم
ئەو وتی: بڕوام نییـە تـۆ نالـەباری تێپەڕە
من وتم: هـاتوومە لات هەر بۆ ئومێدی دیـدەنی
ئەو وتی: لاچۆ بڕۆ کـەی جـان نیشاری تێپەڕە
من وتم: ئـەو دوو هـەنارەی بانی سینەت هی منە
ئەو وتی: کـەی خاوەنی باغی هـەناری تێپەڕە
من وتم: ئەو کوڵمە ساف و جوانە ماچێکی ئەوێ
ئەو وتی: بێ شـەرمی دیارە ڕێبواری تـێپـەڕە
من وتم: هاوڕازی تۆ بووم گیانی شیرین ســاڵی پار
ئەو وتی: کەی بیرمە تۆ یاری پـاری تێپەڕە
من وتم: میوانی مـن بـە تـاقـە یـەك شەو تا بەیان
ئەو وتی: هـەی هـەی ئـەتۆ وەك ژاری ماری تێپـەڕە
من وتم: توخوا قبـوڵم کە بە کۆیلەو عەبدی خۆت
ئەو وتی: تۆ کەی بەهێزی ئیشوکاری تێپەڕە
من وتم: با بێم لـەگـەڵتا گیانـە بۆ ئاوی دوکان
ئەو وتی: کابرا مـەگـەر تۆ شێت و هـاری تێپـەڕە
من وتم: پارەم هـەیـە پڕ قاسەیەك پێشــکەش بەتۆ

ئەو وتی:            کـەی خـاوەنـی زێـڕو دیـناری تـێپـــەڕە
من وتـم:            زۆر دڵرەقـی دەرحەق بەمن هەی خوانەنـاس
سا بڕۆ تۆ کەی لە جوانی بەهرەداری تێپەڕە
جوانی تر زۆرە  کە پێشکەشـــیان بکەم من ئەم دڵەم
تۆ کەوا نـایـزانی هـیچ قـانـونـی یـاری تـێپـەڕە

١٩٧٩/١١/١

***

# قسەی ناحەق ئەکەی

گیانەکەم بۆچی لە دەرحەق من قسەی ناحەق ئەکەی ؟
بـۆچـی ویـژدانی بە نـرخت بەم قسانە لەق ئەکەی؟
بۆ کـەسـان و ناکەسـان نـەرم و نـیان و رووگـەشـی
بـۆچـی بـۆ مـن رۆحـی شـیرینم لە بـەردی رەق ئـەکەی؟
تـیٚ ئـەگـەی غـەیری غەمی عەشقی ئەتۆی تیٚدا نییە
گەر دڵ و جەرگ و دەماغیشـم بە خـەنجەر شەق ئەکەی
چاوی جوانت زۆر بە خۆشی سـەیری غەیری من ئەکات
کـاتـیٚ سـەیـری مـن ئـەکەی تۆ چاوەکانت زەق ئەکەی

١٩٧٩/١١/٧

***

# جیٚ بەجیٚ بکریٚ

هەموو فەرمانی دڵدارم ئەبیٚ هەر جیٚ بەجیٚ بکریٚ
کەسیٚ کەس بیٚت کە کرداری فیداکاریٚتی پیٚ بکریٚ
گەلیٚ پیٚویستە دڵبەخشەر سەر و ڕۆح و دڵ و گیانی
ببەخشیٚ بۆ نیگاریٚ وا ئومیٚدی چاکی لیٚ بکریٚ
خەریکم عەتری زۆر بۆن خۆش لە بۆ ئەو یارە پەیداکەم
ئەگەر دەستم کەویٚ چەند شووشەیەك وا عەتری تیٚ بکریٚ
ئەگەر ئەو جوانە ویستی ڕوو بکاتە کۆشکی دڵداری
لە لایەن ئیٚمەوە فەرزە بە خۆشی ئەو بەڕیٚ بکریٚ
بە تەنها هەر ئەوە یەزدانی شۆخانی هەموو کوردە
ئەریٚ بیٚجگە لە ئەو سەرداری دڵداران بەکیٚ بکریٚ؟
بە مەیدانی ژیاندا تیٚپەڕیم تا تیٚ بگەم چۆنە
ئەوەی پیٚویستییە زانیم لە ڕیٚ ی ژینا ئەبیٚ بکریٚ

١٩٤٩/١١/١١

***

# ڤینۆسی جوانی

گەرچی ئەڵێن خوای جوانی ڤینۆسەکەی یۆنانی یە
من بەمە بڕوام نییە خوای جوانی کوردستانی یە
ئەو نیگارو شۆخ و جوانەی لەم ولاتەی ئێمەدان
باوەرت بێ وێنەیان قەت لە هەموو دنیا نییە
گەر ئەفەرمووی کەم کەمێ ئەڵمانیاش جوانی هەیە
ڕەنگە وابێ...چونکە کورد هاو عونسری جەرمانی یە
یارەکەم کوردی کە نازانێ گوناهی ئەو نییە
دایکی بادینانی یە باوکی ئەصڵ سۆرانی یە
پێی وتم: ڕۆژێ (لماذا لا تعلمني اللغة) ؟
بەم نەزانی کوردی یە جەرگ و دڵم بریا نی یە
ئەو نەفامەی خۆی بە شازادەی ولاتمان دائەنا
وا تەواو دەرکەوت لە پاشا نەتەوەی پاشا نییە
من بە قوربانی کەسێکم ون نەکا کوردایەتی
گەر لەبەر پارەش ونی کرد بنەچەی شەیتانی یە

١٩٧٩/١٢/١٢

***

# ئاگری غەم

ئەو نیگارەی شەو بە لای من دا کەوا لای کردەوە
ئاگری غەم چی لە دڵمابوو هەمووی دامردەوە
رووی لە من کردو وتی میوانی من بە تا بەیان
ئەم دڵە ڕەنجاوەمی بۆ لای جەنابی بردەوە
من کە دەسکەوتم لە ژینا هاودەمی ئەو یارەیە
ئیکە بۆچی تل بدەم هەردەم بە داخ و دەردەوە
پرتەقاڵی سینەیم ئەمڕۆ بە نەرمی تێر گوشی
لایبە لیمۆ گیانە چیم داوە بە ڕەنگی زەردەوە
ئێستە دڵشادم کە بەردەرگانەکەی یار جێگەمە
بۆچی ئیتر من بسوتێم وا بە دەشت و هەردەوە
من بە حاڵ و ماڵی دنیا تازە هیچ کارم نی یە
هەرچی هەمبوو ڕۆی بەیەکجاری بە دەستی مەردەوە
زۆر بە خۆشی من بەسەر پردی ژیانا تێپەڕیم
شەو کە گۆنای نیگارم دی لە ژێر پەردەوە

١٩٧٩/١٢/٢٣

***

## شەرمەسار ئەمێنم

لە بۆ دڵداری شیرینم ئەبێ من گوڵ بکەم پەیدا
ئەگینا شەرمەسارم من ئەمێنم هەر وەکو شەیدا
لە بەزم و ڕەزمی گوڵزارا لەگەڵ یارانی ئازادا..
ژیانم تێپەڕی ئیمشەو لە بەزمی عارەق و مەی دا
ئەمن پێویستە تێپەڕ کەم ژیانم هەر بە دڵشادی
بەڵام چی بکەم براکانم ئەگەر ئەم کارە خوا نەیدا
کە دەستم کورتە ناگاتە هەناری بانی سینەی یار
بە ناچاری گەڕام ئەمشەو لە ناو باخی گوڵ و بەی دا
ئەبێ چی بێ ئە من چارەم کە بەختم یاریدەی نادا
کە ئاهم پیشەبێ قوربان لە کات و ساتی ئۆخەی دا

١٩٨٠/١/٣
***

# لە ڕێ ی دڵداریا

نییە کەس چەشنی من سوتابێ بۆ تۆ
لە ڕێی دڵداریا فەوتابێ بۆ تۆ
لە باخچەی گشتیا بۆت چاوەڕوانم
وەکو من کێ هەیە دامابێ بۆ تۆ
بە برژانگ و برۆ بەر پێت ئەماڵم
لە ڕێتا هەر منم ئاوابێ بۆ تۆ
کە ناساغی گەیشتە گیانی جوانت
دوو چاوی من بوو زۆر گریابێ بۆ تۆ
دڵ و ڕۆح سەر و ماڵم فیدات بێ
هەرچی هەبێ و لە ماڵا مابێ بۆ تۆ

١٩٨٠/١/٧
***

# پیشەی منالّی گرتووە

یاری بالا بەرزی من پیشەی منالّی گرتووە
ڕۆحی ئێمەی هەر بە غەمزەی چاوی کالّی گرتووە
سەیری سینەی مەڕمەڕیم کردو سەرم سوڕما وتم
سەیرە لام ئەم داری سەروە پرتەقالّی گرتووە
کولّمەکانی وەك بلور مابوون لە سالّی پێشووا
ئێستە ئەو کولّمە بلورە ڕەنگی ئالّی گرتووە
دلّ لە جوانی ئەو دەم و لێوە خەریکە بۆ فڕین
هەر ئەلّیٚ ی پەروانەیەو و تازە بالّی گرتووە
دەستی قەت ناگاتە دەستی نازکی یاری جوان
بێگومان ئەو عەشقەی ڕێگەی خەیالّی گرتووە
((شاری)) زۆر شاران گەڕاوە شارەزای دنیا بووە
گەرچی لەم چەرخە ژیانی تامی تالّی گرتووە

١٩٨٠/١/١١

***

# پێم ڕەواکە

له تۆ ماچم ئەوێ سا پێم ڕەواکە
هەموو دەردی دەرونی من دەواکە
سروشتی تۆ جوانە گیانی شیرین
هەرچی کارێ کە ئەیکەی جوانو چاکە
ئەوەی وا لافی لێدا بۆ جووانی
کە تۆی دی شەرمەسارەو ڕووی لە خاکە
دڵم بەخشیوە پێت و هیچ نییە لام
دەسا ڕۆحیش بە عەشقت ئاشناکە

١٩٨٠/٢/٥

***

# خۆزگە

خۆزگە بەو کاتەی کە تۆ یاری منی ئاوارە بووی
خۆزگە بەو ساتەی کە هاوڕازی دڵی بێچارە بووی
خۆزگە بەو ڕۆژەی کە تۆ دەرکەوتی کاتی ڕۆژهەڵات
چاکترین ڕووناکی ڕۆحی خەڵقەکەی ئەم شارە بووی
خۆزگە بەو ساڵەی کە تۆ پیرۆزی ژینت دا بە من
تۆ فریشتەی پاکی ئازادی هەزار پەتیارە بووی
خۆزگە ئەمزانی لە گوڵزاری بەهەشتا گەورە بووی؟
چونکە شیرین تر گوڵی بۆنخۆشی ئەم گوڵزارە بووی
خۆزگە جوانانی هەموو عالەم ئەهاتن ڕوو بە ڕووت
تا بزانن تۆ کە سەرداری هەموو ئەم یارە بووی

١٩٨٠/٢/٢

***

## چارەی تۆ

چارەی من و چارەی تۆ
دنیا ئەکاتە بەهەشت
ئەو پرچە رەشمارەی تۆ
من ئەخاتە دەرودەشت

*　　　*　　　*

جوانی دوو چاوی مەستت
وا گێژو وێژی کردووم
لە زۆر و زەبری دەستت
کەوتووم و نیوە مردووم

*　　　*　　　*

رێگەم بدە بێمە لات
تەماشات کەم تێر و پڕ
رۆحم ئەکەمە خەڵات
سەیرم مەکە سارد و سڕ

*　　　*　　　*

چل رۆژی تر بەهارە
ئۆغر ئەکەی بۆ سەیران
رەحمت بێ بەم هەژارە
منیش بێم رۆحی رەوان

١٩٨٠/٢/١٠

***

## گێژاوی خەیاڵ

سوخمەی سەهۆڵی بان کراسی ئاڵ
وا منی خستە گێژاوی خەیاڵ
لە ژێر کراسی بریقەدارا..
دێتە بەرچاوم جووتێ پرتەقاڵ
نزیك بوومەوە لەو نەو نیگارە
لە بۆ تەماشای کولم و چاوی کاڵ
بۆ تاقە ماچێ لەو دەم و لێوە
ئەپارامەوە هەروەکو مناڵ
ئەو شۆخە لە من هەنگوینی ئەویست
بۆ دەسکەوتنی گەڕام ماڵە و ماڵ
هەتا دەستم کەوت گەلێ ماندو بووم
چا بوو لای نەچووم بە دەستی بەتاڵ

١٩٨٠/١٠/٢٥

***

## ئەبم مەست

به بـادەی سادە کاتێ من ئەبم مەست
لە مێشکما ئەجووڵێ زوو بەزوو هەست
لەبـەرچاوم هەمـوو شت جوان ئەبینم
بە شادی خۆی ئەگا بێ شك دڵی پەست
ئەوەی دەمویست و زۆر دووربوو لە دەستم
بـە ئاسانی هەموویـم دێتە بەر دەست
هـەزار تـانـەم کە لێدەن خـزم و یاران
کـە بـەم تـانەو وتانە نیمە دەربەست
بـەڵام لـەم کاتە گەر یار لێم برەنجێ
ئەگاتە ناخی دڵ خێرا غەمی خەست

١٩٨٠/٧/٨
***

## لە یەکەم ڕۆژ کە تۆم دیوە

هەر لە یەکەم ڕۆژ کە من تۆم دیوە
ئەم دڵە چاکەم بە تۆ بەخشیوە
من لە یارانا هەر تۆ ئەناسم
عەشقت لە ڕۆح و دڵم چەسپیوە
لە ئووسوڵی عەشق گەلێ شارەزام
لەم کارە ڕێگای راستم بڕیوە
وا گەیشتومە پایزی ژیان
گەڵام لە باغی ژین هەڵوەریووە
گیانی هەژاریم گەلێ بەڕێزە
خۆشیم لە ژینا نە زێر نە زیوە
وا پێشکەش ئەکەم بە یاری شیرین
لە گوڵشەن چەپکی گوڵم چنیووە
ئەو کەسە لە ژین شادی دەسگیر بوو
لە باخ و گوڵزار تێر هەڵپەریووە

١٩٨٠/١١/٢

***

# من نەگۆڕاوم

مـن نـەگۆڕاوم تـۆ بۆچ وا گـۆڕای
گونـاهـم چـی بوو بۆچـی وا تۆرای
بـەڵـێنـت پـێدام کە دڵسـۆزم بـی
جاران وا نەبووی ئێستا بۆچـی وای
باوەڕم هـەبوو بە هەستی پاکت
خۆت چاکی بـەڵام لـە ڕێ لادرای
ئـومێدم زۆرە دڵـت نـەشـکـاوە
لە دڵسـوزی مـن بێشـك دڵنیـای
ئـەگـەر گـەرەکتە ئەبمە قوربانت
لە ڕاسـتـی قسەو وادەم شارەزای
ئەچیە سینەما هەندێ وێنەت دی
ئەو سینەمایە سەری لێ تێك دای
ئەی دڵ دڵداری هێشتا فێر نەبووی
بە دەسـتی یاران هەزار جار شکای

١٩٨٠/١٠/١٣

***

## بێ شارەزایی

لە نـاو شـارا گـەڕام بێ شـارەزایی
لـەبـەر ئازاری بـێزاری و جـودایـی
وتم: با سـەعاتێ دووربم لە سەغلەت
تـەمـاشـاکـەم لە کـرداری خـودایـی
بەڵام لەم گەشتە زۆر سـەیرە کە چیم دی
هـەژاری، دەردەداری، بـێ نـەوایـی
هـەموو کەس هەر خەریکی کاری خۆ بوون
لـەگـەڵ کـەسدا کە نـەم دی ئاشنایی
وتم: هـەر من بە تەنیا رەنجەڕۆنیم
نـیـیە بۆ خۆشـی ژیـن قەت دڵنیایی
ئەوەی لەم ژینە ساتێ خۆشی دەسکەوت
ئـیـتر نـابـێ ببـێ بـەم ساتە بایـی

١٩٨٠/١١/٢٢

***

# جێی شانازییە

یـار کەبێتـە لام جێی شانازییە
ئـەویش مـەبەستی بۆ دەسبازییە
ئـەو هەرچی فەرموو سەرم لە ڕێیە
من هـەرچی ئـەڵێم ئەویش ڕازییە
گەر وتی: بمرە دەس بەجێ ئەمرم
مردن ئەوپـەڕی دڵنـەوازییـە
کە ئەو دولبـەرە وا دڵسۆزم بێ
بۆ ئازاری دڵ چارەســازییـە
کە یەکترمان ویست ئێمە ئیتر کەی؟
کارمان بە شێخ و مەلا و قازی یە
ئەو نـازەنینە بە عیشوەو بەناز
هات و ڕوح بەســتەی ڕازو نازییە
بۆ ئـەوەی دووربم لە چاوەڕوانی
هـەمیشە لای بم وا نیـازییـە

١٩٨٠/١٢/٣

***

# کەمێك ڕەنجا بوو

کە یار تەشریفی پەیدا بۆتەوە
یانەی دڵشادی ئاوا بۆتەوە
کەمێك ڕەنجا بوو لە ئێمەی هەژار
لەگەڵمان هەستی وا چابۆتەوە
ئەوەتەی ئەمڕۆ ئەو شۆخەم دیوە
دڵم بۆ خۆشی وریابۆتەوە
یار لە ناحەزی بەد ئێستا دوورە
سوپاس بۆ خوا کە جیابۆتەوە
لەو بەد ڕەوشتەی دوژمنی من بوو
ئەستێرەی ئومێد ئاوابۆتەوە
دڵ هیوای زۆرە ئەمڕۆ بە نیگار
بەتەمای ماچی گۆنا بۆتەوە

١٩٨٠/١٢/١٥

***

# بۆچی لا نادا

یار بۆ لای ئێمە بۆچی لا نادا
غەمی دەروونمان وا بە با نادا
بەڵام ئومێدم زۆرە بە نیگار
هیوای خۆشیمان بە هەوا نادا
ڕووی ڕووناکی یار وەك کارەبایە
کەس شوعلەی گلۆپ بە چرا نادا
یارم ڕەوشتی پاك و بەڕێزە
جنێو بە دۆست و ئاشنا نادا
ئەوەی لەگەڵ یار لە باغا ژیا
گیانی بۆ بەهەشت بە تەما نادا
هەرکەس بۆ ژیان خەمی خۆیەتی
برا سەرمایەی بە برا نادا

١٩٨٠/١٢/٢٧

***

## دڵم لە تۆ سەغڵەتە

دڵم لە تۆ سەغڵەتە
بەس لێ بدە نەعرەتە
هەرچەندە شێتی کردووم
ئەو کوڵم خاڵ و خەتە
با ئاشنای ئاشتی بین
هەستە گیانە فرسەتە
ئەوەی هاوڕازی تۆیە
وا لە من بۆتە چەتە
ئەی دڵی بەستەی ئەوین
شەقامی غەم ڕێگەتە
تەنها یەك شێوە نییە
دڵداری سەد بابەتە
نەوەدو نۆی شارەزام
سەدهەمی زۆر زەحمەتە
ئەوەی سەد ڕێگەی بڕی
لە ژین بەشی عوشرەتە

١٩٨٠/١/٨

***

# ئامادە نییە

ئەمڕۆ دڵ بۆ غەم ئامادە نییە
مەیل و ئارەزووی بە بادە نییە
وا لە مێشکما جووڵاوە هەستم
هەستێکی بەرزە هیچ سادە نییە
بە تیشکی خەیاڵ هاوڕازە یارم
من ئیتر کارم بە زادە نییە
کە لە گوڵزاری ئومێدا ئەژیم
کەیفم لە گەشتی سەر جادە نییە
کە یار سەرچاوەی خۆشی ژینم بێ
پێویستیم ئیتر بە مادە نییە
ئەو دڵشادی یە کە پێی بەخشیوم
هەر بەشی خۆمە زیادە نییە
ئەوین ڕووی کردە هەر گیان و دڵێك
خوا کردە کاری ئیرادە نییە

١٩٨١/١/١١

***

# وێرانە نییە

بۆشایی دەروون وێرانە نییە
یانەی تەواوی ئەو گیانە نییە
هەرچی ژان هەبوو نەما لە لەشما
ئەمڕۆ پێویستی بەم ژانە نییە
هەروا بە ئاسان ناسوتێ دڵم
بێ پەڕو باڵە پەروانە نییە
یار هەرچی فەرمووسەرم لە ڕێ یە
تاقەتی لۆمە یان تانە نییە
ئەو شۆخە بۆ من مایە و سایەمە
مەیلی گەوهەری یەك دانە نییە
بازی دڵداریم لە باخی ژینا
پووش و پەڵاشم لە لانە نییە
هەروا لە سایەی جوانی دولبەرمە
گلەیم کە لەم ژییانە نییە

١٩٨١/١/١٧

***

# یارەکەم ڕۆیی

سەرم لێ شێوا یارەکەم ڕۆیی
مایەی دڵشادی شارەکەم ڕۆیی
وادەی دابوو پێم جارێك بێتە لام
تاقە ئومێدی جارەکەم ڕۆیی
لە سایەی ئەوا کارم باڵا بوو
هیوای زۆرخۆشی کارەکەم ڕۆیی
وا دام بە تاڵان ماڵ و سامانم
سەرو سامان و پارەکەم ڕۆیی
تەمام بوو نیگار دەردم چارەکا
تازە وا تەمای چارەکەم ڕۆیی

١٩٨١/١/٣١

***

# دڵم شکا

دڵـم بـە دەسـتـی یـاری جـوان شـکا
ئـەگـەر چـی گـەلـێ بـەگـران شـکا
بەخـتـی من بەشی هـەر تێك شـکـانـە
مەگەر پەیمانەش وەك پەیمان (١) شـکا
شـووشـەی پەنـجـەرەی کـۆشـکـی نێو نیگا
بە نـاڵـەی هەوری ئـاسـمان شـکـا
چونکە یار ئـەمـڕۆ ئـازاری تـوش بوو
دڵـی نـاسـکـی لـە ژیـان شـــکـا
بـۆتـە یـازیـجەی (٢) نـیـگـاران دڵم
لـە یـاریـگـادا بـە نـیـشان شـکا

٧ شوبات ١٩٨١

(١) پەیمان: ئەو پەرداخەیە کە شەرابی تێ ئەکرێ
(٢) یازیجە: گاڵتەجاڕیی، مەهزەلە
***

# گریام

گریام ئەزانی من بۆچی گریام ؟
بەتەمای تۆ بووم ئەمشەو بێیتە لام
تۆ کە نەهاتی  نەهاتی دڵ بوو
بەڵام گیانەکەم ئێستاش بەتەمام
گریام کە تۆم دی لەگەڵ ناحەزما
لەم کارەساتە ماوم بێ ئارام
نەوتی بەدبەختی ڕژا بە لەشما
شقارتەی نەگبەت گڕی تێ بەردام
ئەگەرچی ئومێد لە دڵما ماوە
بەڵام یەخسیری کەمەندی بەڵام
لە خوا ئەخوازم کە تۆ هەر خۆش بی
زۆر گرنگ نییە من مام یان نەمام

١٩٨١/٢/٢٢
***

# یار لە خەو هەستا

ئەو کاتەی لە خەو ئەو جوانە هەستا
شۆڕش لە یانەی مەیخانە هەستا
هەرا پەیدا بوو لە هەموو لاوە
پرشنگ کەوا لەو چاوانە هەستا
کە ئەو دڵدارە سەری داهێنا
بەرق و بروسکە لە شانە هەستا
فیداکاری عەشق ئەو دەمە دەرکەوت
ئاگر لە پەڕی پەروانە هەستا
ئەو ڕۆژە بادەی نەرخی پەیدا کرد
راستی لە پیشەی مەستانە هەستا
خونچە ئەو ساتە دەمی کردەوە
کە بولبولی زار لە لانە هەستا
هەموو پەیڕەوی کاری من ئەکەن
کە یار پەرستی لەم گیانە هەستا

١٩٨١/٣/١

***

# مەستم نەکەی

من مەی ناخۆم مەستم نەکەی
ڕۆژی جەژنە پەستم نەکەی
دەست ئەخەمە سەر مەمانت
بەرهەڵستی دەستم نەکەی
تۆم دیوە هۆشم لا نەما
سەیری هۆش و هەستم نەکەی
هەر تۆ ئومێدی ژینمی
بۆچی تر دەربەستم نەکەی
شیعرم گشتی بۆ تۆ ئەڵێم
تەماشای مەبەستم نەکەی
ئەڕۆم بە ڕێبازی ژینا
دووچاری هەڵوەستم نەکەی
خەستەم کەوتووم لە جێگەدا
توشی غەمی خەستم نەکەی

١٩٨١/٣/١١

***

# گەمارۆی داوم

غەم لە گشت لاوە گەمارۆی داوم
بۆ دڵ، بۆ مێشك، بۆ سەر، بۆ چاوم
ئەمەوێ بچم بۆ شادی گوڵزار
غەم ئەڵێ ناچی من لێرە ماوم
مەی ئەخۆمەوە غەم لێم دوورکەوێ
ئەچێتە ناخی دڵەی شکاوم
ئەچم بۆ لای یار دڵ بکرێتەوە
یار ئەڵێ بڕۆ لە تۆ رەنجاوم
گوێ لە گۆرانی و مۆسیقا ئەگرم
شادی ناگاتە دڵی فەوتاوم
ئەڕۆم بۆ شاران بۆ هەوار گۆڕین
نەختێ سارێژ بێ جەرگ و هەناوم
بەڵام ئەوانە هەمووی بێ سوودە
غەم وای لێ کردووم لە ژین تۆراوم

١٩٨١/٣/٢٤
***

# تاریکە شەو بوو

کاتێ تووشم بووی تاریکە شەو بوو
کە ماچت پێ دام وام زانی خەو بوو
بەڵام دوو چاوت وێنەی گەلاوێژ
پرشنگی ئەدا خاوەن پرتەو بوو
دوو ئەبرۆی ڕەشت بەو شەوە زەنگە
شێوەی لە لای من وەك مانگی نەو بوو
ئەو تانەی ناحەز ئاراستەی کردم
بۆ دڵ هەر وەکو گوللەی بڕنەو بوو
خەرمانی عومرم وا بە با ئەکرێ
هەرچەندە تازە کاتی درەو بوو

١٩٨١/٤/٣

***

## لە پەروازایە

خەیاڵم هەردەم لە پەروازایە
عەشق و دڵداریم لە ڕێبازایە
هۆش و هەستی من زۆر ئاشنای
لەگەڵ کەمان و عود و سازایە
خەریکم بچم بۆ کۆشکی دولبەر
ئەم کارەم دایم لە نیازایە
نابمە هاودەمی قەل و بایەقوش
پەروازی ڕێکم لەگەڵ بازایە
ئەوەی ئەگاتە عەرشی دڵداری
دڵی پڕ هێزو مەردو ئازایە
یار کەوا لە من ئاگادار نییە
وا لە حاڵەتی عەیش و نازایە

١٩٨١/٤/٢٧

***

# جوانی تاقانه

تۆیەك لە جوانی تاق و تاقانەی
یەکەمین گوڵی ئەم گوڵستانەی
تۆیەك خوای جوانی ئەم سەر زەمینەی
لای من پەیکەری سوژدەی زەمانەی
هاتم کە یەك شەو لە لات بمێنم
مایەی دڵشادی بۆ ئەم ژیانەی
لەگەڵ عاشقا بە نرخە هەستت
زۆر دوور لە واتەی بێ تام و تانەی
من هەر گەرەکمە گیانەکەم سێ ماچ
لە تۆ کە خاوەن ئەو کوڵمە جوانەی
لە پەروازا بێ گەر بازی ئازا
کە تۆی دی ئیتر ون ئەکا لانەی

١٣/ئازار/١٩٧١

***

## بێ بەش نابێ

یارم لە شادی قەت بێ بەش نابێ
تا ماچی نەکەی کوڵمی گەش نابێ
ئەو ناحەزەی هەر پیشەی درۆیە
وەها ئەزانێ قەت ڕوی ڕەش نابێ
هەرچی کە ڕۆحی پاك و خاوێنە
تووشی ئازارو دەردی لەش نابێ
پەرداخێ کەوا پڕکرا لە مەی
لە تەنگانەدا قەت بێ غەش نابێ
ئەوەی ژیانی هەروا مەستی یە
بە چل پیاڵەی بادە چەش نابێ

١٩٨١/٥/٢

***

## ئەسپرین باشە

ئەریٚ بۆ ئازار ئەسپرین باشە؟
یا ماچی دەمی نازەنین باشە؟
ئەسپرین بۆ ژان دائیمی نییە
ماچی دەم و لیٚو هەر بۆ ژین باشە
ئەو هەنگوینەی وا لە دەمی یارا
خۆراکی رۆحەو بۆ برین باشە
ئەو قسە نەرم و شیرینەی نیگار
بۆ هیٚزی گیان و لە بۆ تین باشە
کەسیٚکی ناکەس کە ئیٚمەی رەنجان
بۆ ئەو هەر رەنج و غەم و شین باشە
لەگەڵ هەموو کەس لەم جیهانەدا
رووی خۆش و واتەی زۆر شیرین باشە
((شاری)) لەم شارە وا دەر بەدەربوو
بۆ ئەو ریٚبازی هیند و چین باشە

١٩٨١/٥/١٠

***

# چارم ناکا

یار دکتۆرمە بۆچ چارم ناکا
لەم دەردو غەمە رزگارم ناکا
خەنجەری تانە بیماری کردووم
بە ماچی لێوی تیمارم ناکا
ڕەنگە ڕەنجابێ یارم بۆیە وا
سەیری ڕەفتارو گوفتارم ناکا
هەرچەندە بۆ من کە دڵ رەق بێ
لە عەشقی ڕووی خۆی بێزارم ناکا
بێجگە لە دوو ماچ دەرمانی دنیا
چارەی هاوارو ئازارم ناکا
کە ئەو نیکارە سامانی رۆحە
نەبوونی سامان هەژارم ناکا
هەزار مۆسیقاو ئاوازی بڵند
لەخەوی مردن بێدارم ناکا

١٩٨١/٥/١٠

***

# ناوی تۆم هێنا

گوناهم چی بوو ناوی تۆم هێنا
منت نوقوم کرد لە تانەو جوێنا
بەسیە بێ ڕەحمی بەرامبەر بە من
خۆ نەگیراوم گیانە لە خوێنا
گەر بیشم کوژی سەرم لە ڕێتە
بریارم داوە لەگەڵ بەڵێنا
ئارەزووم وایە دڵم نەشکێنی
لە کردەی یاری پەیمان شکێنا
ئەگەر هێمن بی بە تۆی ئەبەخشم
ئاوی (ئاوبارە) لەگەڵ (دەلێنـا)

١٩٨١/٧/١٤

***

# رووی تۆ تەماشاکا

هەرچی لە رووی تۆ یەک تەماشاکا
لە هەموو جوانان ئەبێ حاشاکا
ئەوەی هەر یەک جار کوڵمی تۆی دیوە
بڕوا بە جوانی هیچ شۆخێ ناکا
هەر کەس ئومێدی گەر هەبێ بە تۆ
پێویستە سەر و ماڵی فیداکا
ئەو جوانەی بڵێ لە تۆ جوانترم
تا حەیای نەچووە ئەبێ هەڕاکا
بەڕاستی خۆشی ژیان ئەبینم
گەر بە من بێت و ماچێ ڕەواکا
ئەوەی نەبۆتە گیرۆدەی عەشق
یا لە بەندایە یا وا لە خاکا

١٩٨١/٨/١

***

# بەلاما تێپەری بوون

نیگاران شەو بەلاما تێپەڕی بوون
وەهام زانی کە حۆری یان پەری بوون
ئەوانەی شوێنی ئەو شۆخە ئەکەوتن
هەموو کەم هۆش و سوك و سەرسەری بوون
گولان ئەمڕۆ لە باغا نەشئە بەخشن
بەڵام بولبول نەمابوون کۆچەریی بوون
کەسانێك کاس و سەرمەست و هەژاران
لە بەزم و ڕەزمی گوڵزارا بەری بوون
نیگارانی جوان جەم بوون لە گوڵشەن
خەریکی نازو عیشوەی دولبەریی بوون
ئەوانەی خۆ بە خاوەن هێز ئەزانن
هەوا خوازی پڕۆژەی عەنتەری بوون
لە کەعبەی عەشقی دڵدارانی شیرین
لە خۆشیدا سەرۆکی سەروەریی بوون

١٩٨١/٥/١٦

***

# هات و چۆیەتی

دڵ لە دەوری تۆ هات و چۆیەتی
تەمای چەسپانی جێگەی خۆیەتی
مێشك مەرکەزی دڵداری ڕووتە
تەنها هەر خۆشی ئەوە هۆیەتی
جوڵاوە هەستم بە جۆرێکی وا..
لە تەك ڕۆحما گفتوگۆیەتی
ناحەز دەیەوێ ئێمە لە تۆ کا
وا گوێم لە واتەی پڕ درۆیەتی
ئەوا کەوتووە لە بەر پێ ی یارا
ئەڵێ ی پشیلەی دەستەمۆیەتی
ئەمڕۆ لەگەڵ یار کە کەمێ ڕێکە
بەڵام سبەینێ باوکەڕۆیەتی
ئەو یارە دادی ئێمە نەپرسێ ؟
خوێنی ڕژاوم لە ئەستۆیەتی

١٩٨١/٥/٢٥

***

## وادەی پێ داوم

وادەی پێ داوم گیانی شیرینم
ئەمشەو بێتە لام کەوا بی بینم
لەلام دانیشێ تاقە یەك سەعات
بەڵکو سارێژ بێ زام و برینم
گەر رەحمی جولاَ ماچم پێ بدا
ئاوەدان بکا خەرابەی ژینم
دەستم بگاتە دوو پرتەقاڵی
بەرز ئەبێتەوە پایەی ئەوینم
ئەیگوشم نەرم پرتەقاڵەکەی
پێشکەشی ئەکەم ڕۆحی بەتینم
لە کوڵمی جوانی ڕپتە و داریا
مانگ و ئەستێرە هەمووی ئەبینم
گەر هات و وادەی بەجێ نەهێنا
من تێکی نادەم ڕێگەی ئاینم

١٩٨١/٥/٢٨

***

## خۆشترە لە هەنار

شەپازڵەی دەستی یار
زۆرخۆشترە لە هەنار
جنێو لەو دەمە جوانە
خۆشە لای منی دڵزار

گەر سەریشم بشکێنێ
بە ئاسن و بەردو دار
وا ئەزانم بەخشیشە
بە من ئەبەخشێ نیگار
پارەی لە من گەرەك بێ
پێشکەشی ئەکەم هەزار
بەڵام چونکە ئازایە
خۆی نافرۆشی بە دینار
خۆم ئەکەم بە قوربانی
بۆ ئەوە داومە بڕیار
***

## تۆ فریشتەی

تۆ فریشـتەی کەی نەوەی ئەم عـەردە بـووی
هـەر لـە گـوڵـزاری بـەهـەشت پەروەردە بووی
ئێستـە بانەت ئاسمـانـی حەوتـەمـە
تـازە فـێـری ئـەم مەزارو هـەردە بـووی ؟
هاودەمـت حۆری بـەهـەشتـن بـێ گـومـان
کـەی رەفـیـقـی ئـەو کـورە نـامەردە بووی ؟
مـاچـی کـوڵـم و لـێـوی تـۆ دڵ چار ئـەکا
گـەرچی خۆشـت هـۆی هەموو ئەم دەردە بـووی
ئەی (علی) بۆ چ ڕەنگ و شـێوەت تێك چووە ؟
هـەر ئـەڵـێ ی توشی نـەفام و جەردە بـووی

١٩٨١/٩/٢

***

## بە قوربانتە

ڕۆحم گیرۆدەی چاوی جوانتە
گەردنم بەندی پرچەکانتە
دڵم لە سایەی ڕووی تۆوە ماوە
بە قوربان ئەویش بەقوربانتە
ئەچم بۆ گوڵشەن ئەزانی بۆچی ؟
هەر بۆ دیدەنی کوڵمەکانتە
بۆ ئەوەی ڕووی تۆ تێر تەماشاکا
فریشتەی یەزدان وا میوانتە
خۆزگە ئەتپرسی ئەمڕۆ لە حاڵم
کە چەند چاوەڕێ ی خۆشی گیانتە
هەر من بە تەنیا دڵبەندی تۆ نیم
پەری و پەروانەش پەرێشانتە

١٩٨١/٦/١٧

***

# بە تەنیا ئەژیم

زانیووتە گیانە بە تەنیا ئەژیم
وەك جانەوەری ناو چیا ئەژیم
دوو باڵم هەبوو یەکێکیان شکا
بێ باڵ و پەڕو بێ پەروا ئەژیم
جاران جار جارە لێمت ئەپرسی
ئێستاش بڕوات بێ بە هیوا ئەژیم
هاوسەری ژینم لەبەر چاو نەما
بەبێ هاوسەرو ئاشنا ئەژیم
کە بێ تاقەت بووم چومە نەینەوا
لەبەر تاڵی ژین بێ نەوا ئەژیم
سەرمایەی ژینم ئەوەندە کەمە
خەڵك وا ئەزانێ بە هەوا ئەژیم
چونکە تاریکە سروشتی ژینم
لە ناو ژوورێکا بێ چرا ئەژیم
ئاخۆ تۆ بڵێ ی خوا دڵخۆشم کا
کە یار بێتە لام بە تەما ئەژیم

١٩٨٣/٩/٢٠

***

## دڵی منی خستە بەند

ئەو شۆخە هات لە دەربەند
دڵـی مـنـی خسـتە بەند
هەربە تاقە یەك سەعات
دڵ و ڕۆحی لە مـن سەنـد
وتـم: مـاچم لێت ئەویٚ
وتـی: پێم بفەرموو چەند
وتـم: چوار و پێنچ و شەش
ئەی دولبەری هونەرمەند
وتـی: یەعنی پانزە ماچ
شاعیـری پایە بڵەند
وتم: یا پێم ڕەواکە
یا بیخە ملم کەمەند
ڕوومەتی هێنایە پێش
ماچم کرد سی و شەش و هەند
هەموو بەشەر کۆیلەتن
لەم شارە هەتا سەمەرقەند
فـیدایی تۆن بیٚ گومان
هەر لێرە تاکو ئەڵوەند

خوایە چەند شیرینە
لەو دو لێوە شەکەر خەند
بەرزە نرخی تۆ لە لام
بەقەد کێوی دەماوەند
تۆ زۆر خانەدان تری
لە سەد کەریم خانی زەند
بۆ ئەوەی بیدەم بە تۆ
دڵم لە سینە هەڵکەند
ئەی شێخەکەی خوا ناس
پێویستم نییە بە پەند
من شاعیرێکی هەرزەم
دۆستی سەیران و گۆبەند
خۆ شیعرو هەست و واتەم
زۆر شیرین ترە لە قەند

١٩٨١/٧/١٤

***

## چوومە لای دوکتۆر

چـوومە لای دوکتـۆر کەوا چارم کا
لـەو دەردەی هـەمـە زوو ڕزگـارم کا
وتم: ئەی دوکتۆر مەردی چارەسـاز
چیت لایـە چارەی گشت ئازارم کا
وتـی: دەردی تـۆ چـارە نـاکرێ
ویسـتـی ڕەوانـەی لای دڵـدارم کـا
وتـم: ئەو دەردی بە من بەخشـیوە
گەرەکتـە ئەمجا شێت و هارم کا
با بـتـلـێـمـەوە بـەم ئـازارەوە
بـەڵـکـو یەزدانـی گـەورە چارم کا

١٩٨١/١٢/٤

***

# ئەی بەخشم بە تۆ

ئاوی ئاوبارەو باخی بەکرەجۆ
هی منیش نییە ئەیبەخشم بە تۆ
هەرکەسێ هات و داوای لێکردی
بڵێ هی خۆمە تۆ لاچۆ بڕۆ
یارێك جوان بێ دنیا هی ئەوە
بەبێ سەنەدو قەواڵەی درۆ
ناحەز بە دەوری یارا ئەسوڕێ
هەر ئەمیاوێنێ وەکو دەستەمۆ
منیش بۆ ئەوەی کە تۆ ببینم
وا لە ناو باخا ئەکەم هاتووچۆ
ئەوەی لە عەشقا گێرە شێوێنە
ئاوارە ئەبێ لە ناو دەشت و کۆ
یارێك کە ژیر بێ تەفرە نادرێ
بە قسەی شیرین وەك حەڵوای گەزۆ

٥/تەموز/١٩٨١
***

## لە گوڵشەن دەرچوو..

کە ئەو شۆخە لە گوڵشەن ئێستە دەرچوو
ژیانی پڕ لە شادیمان بەسەر چوو
کە دەستی خستە دەستی پیسی ناحەز
بە من چی یار ئەگەر هات و ئەگەر چوو
هونەرمەندێکی وەك من دەربەدەر مام
کە خوای جوانی لەگەڵ یەك بێ هونەر چوو
وتم قوربان مەچۆرە بەزمی ناکەس
کە بەد ناوی لە دوایە هات و هەرچوو
ئەوەی وەك من پەرێشانی ئەوین بوو
سەری هەڵگرت و ڕۆیی دەربەدەر چوو
کەسێ وەك من لە ژین هەر ژان بەشی بوو
بە مەستی گیانی بەخشی و بێ خەبەر چوو

١٩٨١/٨/١٢

***

## خۆشیی ژیان

لەگەڵ تۆ خۆشیم بە ژیان ئەگا
موچڕکەی شادیم بە گیان ئەگا
ئەگەر دانیشم لەگەڵ تۆ ساتێ
کۆتایی عومر بە غەمان ئەگا
هەرچەندە گیانە بڵندە باڵات
دەستی کورتی من بە داماں ئەگا
پەنجەی لەرزۆکم پێم نووسی نامە
نامەم بە یاری نەوجوان ئەگا
رۆحی پەروانە بێگومان وەك من
لە رێگەی عەشقا بە سووتان ئەگا
ئەو ناحەزەی من پیس و ناپاکە
دەستی چەپەڵی بە شەیتان ئەگا

١٩٨١/٨/٢١

***

# دانیشم لەگەڵ لەیلا

ئەگەر دانیشم شەو لەگەڵ لەیلا
یا لە گوڵزارا یا لە دوجەیلا...
گیانم ئەگاتە ئەوپەڕی شادی
خەفەت کۆچ ئەکا لە دڵی کەیلا
بۆ لەیلای شیرین لە هەموو چەرخا
کەس ناگاتە من هەرگیز لە مەیلا
ئەوەی ناحەز بوو لەگەڵ من و یار
ئۆخەی خنکاوە ئەمشەو لە سەیلا
ئەوەی لە عەشقا گێرە شێوێنە
لە هەردوو دنیا هەر وا لە وەیلا
ئەوەی کە دیومە لە جوانی چاوت
نەمدیوە گیانە من لە سوهەیلا (*)

١٩٨١/٩/١٠

(*) سوهەیل: مەبەست لە ئەستێرەی سوهەیلەیە
***

# میوانی تۆبم

ئومێدم زۆرە شەو میوانی تۆبم
بە رۆح و گیان و سەر قوربانی تۆبم
سەرم سوڕما لە جوانی کوڵم و چاوت
فیدای کوڵم و دوو چاوی جوانی تۆبم
ئەگەر تۆ چی بفەرموی جێ بە جێ یە؟
ئەبێ من مل کەچی فەرمانی تۆبم
بە ڕۆژو شەو هەمیشە رووم لە تۆیە
ئەشێ من بت پەرستی گیانی تۆبم
نەگۆڕاوم لە ئاستی عەشقی رووتا
ئەبێ هەر هاودەمی جارانی تۆبم

١٩٨١/٩/١٩

***

## دانیشتم

بەرامبەر تۆ کە دانیشتم
غەمی دڵ چی هەبوو ڕشتم
کە تووش بووم پاڵەوانی غەم
بە هێزی شادی زوو کوشتم
لە پێش ئەم کاتە پیرۆزە
هەموو تاڵاوی غەم چەشتم
لە سایەی تۆ فیدات بم من
خەریکی زەمزەمەو گەشتم
هەمووی هەر خۆشییەو بەزمە
تەنیشتم هەم بەرو پشتم
لە ناو یارانی دڵخۆشا
سەرۆك و رابەری گشتم
کە پاڵی پێوە نام شادی
بە ئومێدی سەفای دەشتم
ئەگەر چی فێنکە گوڵشەن
هەوا خوای بایەکەی دەشتم

١٩٨١/٩/٢٤

***

## بۆچی ؟

ئەریٚ ئەو گوڵ ڕووە تۆراوە بۆچـی
دوو چاوی سوور بوەو گریاوە بۆچی؟
لەگەڵ باوکی مەگەر دەمقاڵی بووبوو
بەسەرخۆشی کەوا لیٚ ی داوە بۆچی؟
سەرم سووڕما لە پیشەی دایك و باوکی
لە ماڵا هۆی چی یە ئاژاوە بۆچیٚ؟
فریشـتەی سەر زەمینە یـاری جوانـم
قژو پرچی کە تیٚك ئالاٚوە بۆچی؟
بە تـەنـیـا تـاقە دڵسۆزی ئەوم من
لەبەر چی وا لە من رەنجاوە بۆچی؟
لە ڕیٚـگـەیدا ئـەوەستم جوڵە ناکەم
گەرچی هەروا نیگار لەولاوە بۆچی؟

١٩٨١/٩/٣٠

***

## ((لێم هەراسی))

لێم هەراسی گیانەکەم چیم کردووە
ناوی تۆم هەردەم بە جوانی بردووە
بێ وەفا من تۆ پەرستن پیشەمە
ئەو کەسەی تۆی ناوی لای من بردووە
بۆ زیارەت رۆحەکەم گەر خۆم نەیەم
وا بزانە من دڵی خۆم ناردووە
کەس نییە بێجگە لە تۆ شادم بکا
من ژیانی خۆم بە تۆ ئەسپاردووە
ئەو نەفامەی ویستی دڵگیرت بکا
کابرای مل چەشنی نێرکە کاردووە

١٩٦٩/١/١

***

# پیاڵەم پڕکە

ساقی فیداتم پیاڵەکەم پڕکە
بە بادە دڵ و دەماغم سڕکە
دێوی دڵ بۆ غەم هێرشی هێنا
بە شمشێری مەی ئەندامی شڕکە
کە شێخ و مەلا لۆمەیان کردی
گوێیان لێ مەگرە خۆت گێژو وڕکە
فریوت نەدەن ناحەزو ناکەس
حەزەر لە پیاوی نامەردو دڕکە
ئەی(شاری) ی غەمبار سەرت هەڵبڕە
سەیرو تەماشای دوو مەمکی خڕکە
***

## ((هاتوومە لات))

هاتوومە لات دەرم نەکەی
دڵم بە غەم گەرم نەکەی
سەیری دڵی گەنجم بکە..
تەماشای مووی سەرم نەکەی
لە ڕووی جوانت ماچم دەوێ
زوو بم دەرێ شەرم نەکەی
بم ناسە من دڵسۆزی تۆم
بە نەفام تێپەڕم نەکەی
بە واتەی پیاوی نالەبار
ئاڕاستەی خەنجەرم نەکەی
ویستم بژیم لە سایەتا
بێ بەش لە سێبەرم نەکەی
لێم تێناگەی من کێم و چیم
تا سەیری دەفتەرم نەکەی
بەرهەم دارە داری ژینم
بە داری بێ بەرم نەکەی

٩/١٠/١٩٨١

***

# دڵی گەنج

چـی بکـەم لە دەس تۆ ئەی دڵی گەنج
دووچارم نـەکـەی بە هـەزاران ڕەنـج
مـنـت کـردووە بـە گـاڵـتـەی یاران
یـاریم پـێ ئەکەن بە وێنەی شـەترەنج
گیانم سڕبووە لە دەست قورســی غەم
وەك لێ ی درابێ یەك شـرینقەی بەنج
لـە دەس کردەی تـۆ ئەی دڵی نەفام
تـەمـامـە بچمە وڵاتی ئەفرەنج
مـن لـەم ژییـانـە سـەر لێ شـێواوم
تـازە چی بکـەم لـە سامان و گەنج
ئـەی دڵ پـێم بڵێ بۆ تـۆ ئێستاکە
بە کەڵـکی چی دێ گەمەو لار و لـەنج

١٩٨٢/٢/٢٠

***

## بەفرو سەرمایە

بەم گەردەلوول و بەفرو سەرمایە
خەیاڵی ڕۆیین وا لە سەرمایە
لە کاروان سەرای بازاڕی غەمدا
سەرم زۆر قاڵە بەبێ سەرمایە
هۆشی دروست و بەرزی دڵداری
هەروا لە ناخی دڵەی گەرمایە
ئەو تیرەی نیگار کە بۆی هاویشتم
نوکە تیژەکەی لە جگەرمایە
تنۆکی خوێنی زاماکەی دەروون
ئێستا لە پێڵوی چاوی تەڕمایە
ئەو کراسەی یار بەخشی بووی بە من
هەتاکو ئەمرم وا لە بەرمایە
خۆزگە بەو کەسەی خودا پێ ی داوە
شەو لە باخەڵی گەرم و نەرمایە
منیش لە جیاتی هاوسەرو هاودەم
سیسرك لە حەوش و ژوورو دەرمایە
وەهام بڕیارە شار بەجێ بێڵم
گەرچی سەد خەتەر لە سەفەرمایە

١٩٨١/١٠/٢١

***

## فەرموو

ئەگەر مەیلت لەگەڵ من ماوە فەرموو
دڵی نەرمت لە من نەشکاوە فەرموو
کە تۆ لەولاوە هاتی ڕوو بە ڕووی من
تەمام رووکەیتە من لەملاوە فەرموو
لەسەر سەرچاوەکەی ژین ڕائەوەستم
دەسا بێن گیانە بۆ سەرچاوە فەرموو
کەوا کەوتومە ناو داوی غەمی دڵ
دەرم بێنە دەسا لەم داوە فەرموو
وەرە میوانی من بە تاقە یەك شەو
هەتا گیانم لەبەردا ماوە فەرموو
لە جوانی تۆ کە من بێ بەهرە ماوم
قسەی پێ ناوێ لەم پێناوە فەرموو

١٩٨١/١٠/٣٠

***

# بادە نۆش ئەکەم

ئەو دەمەی کەوا بادە نۆش ئەکەم
حەز لە گۆرانی و قسەی خۆش ئەکەم
هەستم ئەجووڵێ لە بۆ خۆشخوانی
مەیلی بەرهەمی دڵ و هۆش ئەکەم
ئەچمە لای یارێ کە بە حورمەت بێ
لەعنەت لە یاری خۆ فرۆش ئەکەم
گەرچی زانا بم وەکو فەیلەسوف
کە ئەوم دی من قسەی بۆش ئەکەم
هەندێ جار کەوا کەم تاقەت ئەبم
ئارەزووی بەزمی زۆر بەجۆش ئەکەم

١٩٨١/١٢/١٣

***

## له لایەك

چاوی ڕەش لایـەك کوڵمی گەش لایـەك
دڵمیان خستۆتە گێژی دەریایەك
دەریـای دڵداری شـەپۆل بـێ پـایان
با فـریام کەوێ چەند ئاشنایەك
تـا نـەخنـکـاوم با رزگـارم بـێ
لەسەرم دەرکەم هەموو خولیـایەك
تـەمـەنم بـەرزەو دڵـم نەفـامـە
دوور بە دوور بەسمە نیوە نیگایەك
تانـەی ناکەسان وا پەستی کردووم
خـەریکم بڕۆم بۆ سەر چیایەك
لـەوێ ئامـادەم بە تـەنیا بژیـم
لە بیـربـەرمـەوە هەموو هیوایەك
***

# ئەگەر بێیتە لام

ئەگەر بێیتە لام هەر تاقە شەوێک
یان تێپەڕی لام وێنەی پڕ تەوێک
دڵم ئەبینێ نەشەی خۆشی ژین
گەرچی زۆر کەم بێ هەر وەکو خەوێک
وەها کوشتومی تانەی دۆست و یار
قەت وا نامکوژێ گوللەی بڕنەوێک
تۆ هەر ئەمێنی بۆ من بە یاری
بۆ ئەمە نایکەم بۆ کەس گرەوێک
تازە کەوتومە داوی دڵداری
چۆن دووچار ئەبێ بەسزمان کەوێک
***

## ڕزگار ئەکەم دڵ

لـە دەس دڵـداری مـن ڕزگار ئـەکەم دڵ
لە نازو ڕازی یار بـێـزار ئـەکەم دڵ
لەگەڵ بـێـهۆشـی هەردەم ئاشـنا بوو

بە پیاڵـەی بادە هووشیـار ئـەکـەم دڵ
گەلیٚ بـێـچارە بەنـدی داوی ئەو بوو
بەرم دا ئێسـتا هـەتا چار ئەکەم دڵ
بە خۆشـی بردە سـەر دڵ پـار و پێرار
بە یادی بەزمـەکـەی پێرار ئەکەم دڵ
بمێنیٚ با بە خۆشـی و شـادمـانـی
ڕەوانەی گوڵشـەن و گوڵـزار ئەکەم دڵ
لە دووری چـیمەن و رووبـار و کـارێـز
بە بادەی سـادە من تـیمـار ئەکـەم دڵ
هەتا ماوم بـە دەرمـان و بـە سەیران
تەریـکی من لـە هـەر ئازار ئەکەم دڵ
ئەوەی دی بووی لە دەس عەشق و لە دەس یار
هەمووی یەکجارە بۆ تۆمار ئەکـەم دڵ
١٩٨٢/٢/٢٥
***

## هات بە لەنجەو لار

نیگار هات بە لەنجە و لار
دای لــە دڵـم یـەك پلار
پـلاری عـەشـق و جوانـی
نـــەك پلاری بـەردو دار
دڵـی خسـتمـە خـوارێ
کـەوتـە ئاوی سـەرچنار
ئـاو زوو دڵـی ڕاپێـچام
بە گوڕ بردی سـەرە و خوار
بە پـەلـە شوێـنی کەوتم
کە بیگرمـەوە نـاچار
زۆر بە خێـرا ئەڕۆیشتم
وەك نەفام و شێت و هار
بـە داخـەوە ئـاو بـردی
بۆ زەلـکاوی ماسی و مار
هیچ کەس نەکەوتە فریام
هـەرچەنـدە کـردم هاوار
بـۆ خـۆم بـێ دڵ مـامـەوە
بێ هۆش و گیان بە ئازار
ئەمەش کارەساتی عەشق
کـردمی پەسـت و هـەژار
١٩٨٢/٣/١
***

# نا، نا.. درۆم کرد

وتم تۆم خۆش ئەوێ (نا، نا) درۆم کـرد
بـە ڕێبــازی درۆدا هاتــووچۆم کـرد
وەهام زانی کە زۆر شـیـرین و جـوانی
بە کەم هۆشی کە دوێ شەو سەیری تۆم کرد
کە کـاتـێ تێـگەیشتم من غەڵەت بووم
دوعـای فەوتانی ڕۆحی خۆم لە خۆم کرد
لە لای مـن ئاشـکرا بوو بەد سروشتی
لە تـەك عەقڵ و دەماغا گفتوگۆم کرد
بە تـەنیا تـاقە ڕۆژێك هـاودەمت بووم
زوبانت ئیفـتـیرای با پـاکی بۆم کرد
وتم: نەك عەشـقی ڕووت چوبێتە ناو دڵ
بە ئاوی بیـری زەم زەم شـوست و شۆم کرد
لە ناو دڵ مابوو گەرچی چەند تنۆکێ
لـەگەڵ هـێزی هەناسـەم ئێسـتا ڕۆم کرد
لـە تۆ دوورم دڵـم ئـازادە ئـەمـڕۆ
کـە مەیلی دابوو پـێت قوربـان درۆم کـرد

١٩٨٢/٣/١٠

***

# ئاخۆ ؟

لەســەر چی یار لە من تۆراوە ئاخۆ ؟
لە عاشـق یـار بتـۆریٚ باوە ئـاخۆ ؟
وەکـو پـەروانـە چوومە بەر چـرای ڕووی
پـەڕو بالـم هـەمووی سووتاوە ئاخۆ ؟
جنێـوی بەخشـی ئـەو یارە بە ئێـمە
ئەریٚ ئـەم کـارە مۆدەی مـاوە ئاخۆ ؟
کـە تـانـەم دا لە پیشـەی کەم وەفایی
لـە من دڵـگیر بووە گـریاوە ئـاخۆ ؟
کەبـابی ئەم دڵەی من سوور و سوێر بوو
مەگەر هۆی ئەشکی وەك خوێناوە ئاخۆ ؟
بـرا گەل پێم بفەرموون من ئەخنکێـم ؟
کـە زنجیرم لـە مـل ئالاوە ئـاخۆ ؟
ســەرم گێژەو دڵم  بێـهێـز و پەسـتم
مـەگەر هەستم لە کار وەسـتاوە ئاخۆ ؟
لـە تـاریکی شـەوا دڵ یـار ئـەبینـیٚ
ئـەریٚ دڵ خـاوەنـی دوو چاوە ئـاخۆ ؟

١٩٨٢/٣/٢٢

***

## خودا پیێ دا بەختیارێ

خـودا پـیێ ی دا بەخـتـیارێ
دەسـتـی خسته دەسـتـیێ یارێ
دەست و پەنجەی نەرمی گوشـی
لە پاشا جـووتـە هەنـارێ
یارێکی زۆر شیرین و شۆخ
بـالا بـەرزێ وەك چـنـارێ
روومـەت گـوڵـی، دەم نـقـوڵـێ
پەرچەم ڕەش، دیـدە خومارێ
وێـنـەی نەبوو لـە عالەما
نازەنـین بـوو عـیشـوە دارێ
وادەی دایــێ کـە سـبـەینێ
بـەسـەر بـەرن ڕۆژگـارێ
بـەمـەی بەنەی بە سۆز و ساز
تێپـەڕ بـکـەن هەموو کارێ
عـاشـق سـەد دیـناری دایـێ
مەسـرەفیش پەنجا دینارێ
بەڵام وادە بەجـێ نـەهـات
مـایـەوە ڕەنج بەخـەسارێ

١٩٥٩/٩/٩ لە چوارتا

***

# کە تۆ ئەبینم

کە تۆ ئەبینم یاری بەد میزاج
دڵم لێ ئەدا وەك گونی هەلاج
تۆش من ئەبینی لە بۆ جنێودان
دەم ئەکەیتەوە وەك قاپی گەراج
لە تاو بەد کاریت دەرچووم لە شارا
هەرچیم بوو، نەبوو رۆیی بە هەڕاج
ڕووم کردە چۆڵ و چیاو بیابان
تا هاتە رێگەم کۆسپی ئیحتیاج
عاشق لە پێناو جوانی دڵدارا
خۆشە بیبەخشێ سامان و خەراج
ئەوەی دڵی تۆی وا لە من ڕەنجان
خووا رووی رەشکا هەر وەك بنی ساج
١٩٨٢/١٢/٢٤ بەغداد

***

# له ژین بێزارم

هەرچەند دەمێکە لە ژین بێزارم
بەتەمای ماچی سەرکوڵمی یارم
ئەگەرچی لە شار من دەربەدەر بووم
بە دڵ و بە ڕۆح هەروا لە شارم
من لە پێناوی عەشقی نیگارا
لە خۆشخوانیا سەرمایەدارم
غەمی دڵ منی کردووە پەژارە
ئومێدم زۆرە یار بکا چارم
گەلێ زەنگینم لە بیر و هۆشا
قەت بڕوا مەکەن کەوا هەژارم

١٩٨٢/٤/١

***

## بە دەستی نەرمت

دەستم کە بگری بە دەستی نەرمت
بەرامبەر بە من نەمێنێ شەرمت
پێشکەشت ئەکەم ڕۆحی بێ نەرخم
ئەبمە قوربانی هەناسەی گەرمت
چەندە لام خۆش بوو کە دوێنێ فەرمووت
هەر کاتێ مردی دێمە ژێر تەرمت
بێگومان گیانە زیندوو ئەبمەوە
بێتە گوێم واتەی شیرین و نەرمت
گیانم فیدات بێ لە بیرم نەچووە
خستتە سەر ڕانت ئەو ڕۆژە سەرمت

١٩٨٢/٤/٦
***

# فەرمانی داوە

که ئەو یارە بە من فەرمانی داوە
چ ڕێگەی سەرکەشی بۆ من نەماوە
وتی: گیانت فیدای من کە وتم باش
ئەگەر نەیکەم دڵی یار لێم شکاوە
خودا نەیکا دڵی بشکێ لە من ئەو
لە بۆ من کاری وا زۆر ناتەواوە
بەقوربانی ئەکەم سامان و گیانم
کە بۆ من شادی یە ڕووناکی چاوە
ئەوانەی ویستیان یار لێم بڕەنجێ
خەیاڵێکە لە لایان پوچ و خاوە
بڕۆن بمرن بە داخی دڵ هەژاران ؟
دەهۆڵی نالەباریتان دڕاوە
لە بۆ فەوتانی بەدخواهانی دڵدار
بەهێزی ڕۆح و هەڵمەت بوومە کاوە

١٩٨٢/٤/١٧

***

# دەستم بۆ لیمۆ برد

لەسەر ئەو سینەی مەڕمەڕی نەرم
خەریك بوو دەستم بۆ لیمۆ بەرم
لێم هاتە جەواب وتی: لیمۆ نییم
من پرتەقاڵم کابرای بێ شەرم
وتم: گەر لیمۆی یا پرتەقاڵی
بوویتە زینەتی سنگی دولبەرم
دەستت بۆ ئەبەم ماچیشت ئەکەم
هەمە لە جوانیت جۆشێکی گەرم
لە ڕێگەی عەشقی ڕووی ئەو نیگارە
پێم خۆشە دانێم من ڕۆح و سەرم
ئەگەر هەموو ڕۆژ ڕووی ئەو نەبینم
وەها ئەزانم کە دەربەدەرم

١٩٨٢/٤/٢٨

***

## حەقم نییە بەسەریەوە

ئەو یارە هەر کارێ ئەکا
حەقم نییە بەسەریەوە
مەیلی چ گوڵزارێ ئەکا
من ئەچمە ژێر سێبەریەوە

*　　　　*　　　　*

بە من ئەڵێ کاکە (عەلی)
منت بە ڕاستی خۆش ئەوێ
تۆ پیاوێکی ژیری گەلێ
ئەوەی خراپە ناتەوێ

*　　　　*　　　　*

وتم ئەی گیانی شیرینم
رۆح و هەت و بیر و هۆشم
لە جوانی تۆدا ئەبینم...
کۆیلەم لە قاپیا خۆشم

*　　　　*　　　　*

من ئەگەر بێ تۆم خۆش نەوێ
ژینم شتێکی بێ نەرخە
تۆ ڕۆحمی و هەر تۆم ئەوێ
دەسا ڕووی خۆتم بۆ دەرخە

١٩٦٢/٦/٩

***

## بە دەستی تۆ شکاوە

وتم: دڵ وا بە دەستی تۆ شکاوە
وتی: ئەم واتەیە مۆدەی نەماوە
دڵێك وەك شووشە وا سوك و تەنك بێ
شەقی تێ هەڵدە تۆ هەر بیخە لاوە
وتم: ڕۆحم لە دەوری تۆ ئەسووڕێ
وتی: وا دیارە جێگەی لێ بڕاوە
کە ڕۆحێك هات و وا خوێڕی و گەڕۆك بوو
بڕۆ بیدە بە دەم باکەی سەباوە
وتم: وا لەسەر لەبەر ڕێبازی تۆدا...
وتی: کەی سەر لە ڕێگا دانراوە ؟
سەرێك وەك دارو بەردو خشت و گڵ بێ
دیارە مەغزو هۆشی تیا نەماوە
وتم: سامان و ماڵم پێشکەشت بێ
وتی: مەیلم بە پارەو زێڕ نەداوە
ئەوەی بۆ ماڵی دنیا خۆ فرۆشە
مرۆڤێکە کەوا سوك و گلاوە
وتم: وەختە ژیانی من تەواو بێ
وتی: تۆ هەر ژیانت ناتەواوە
ئەوا عومرت لە حەفتا تێپەڕیووە
هەموو ئیسقانی ئەندامت سواوە
وتم: دیارە کە تۆ زۆر خوا نەناسی
کە ڕوویەك گیانە ناکەی لای خوداوە
ئەتۆش وا چرچ ئەبێ گۆناو دەم و ڕووت
بۆ گاڵتە ئەتخەنە ناو سینەماوە
١٩٨٢/٥/٢

# جوانی ڕوومەت گەش

له جیاتی یاری جوانی روومەت گەش
من هەیکەلی غەم ئەگرمە باوەش
له جیاتی بەزم و سەیران و شایی
ئازارو نالەو گریەم بۆتە بەش
له بریتی خەندەو قاقای پێکەنین
بەسەریا هێنام نەگبەت باڵی ڕەش
لەبەر ئەم حاڵە وا خۆم هەست ئەکەم
سێ شووشەم پڕە له بادەی بێ غەش
بەڵکو له دڵما خەفەت تێپەڕێ
ئیتر هەزار چش له ئازاری لەش

١٩٨٢/٥/١١
***

## گیانەکەم

گیانەکەم قوربانی تۆ بێ گیانەکەم
رۆحەکەم میوانی تۆ بێ گیانەکەم
سەر لە سەر فەرمانی تۆ جۆشی هەیە
با دڵیش فەرمانی تۆ بێ گیانەکەم
زێڕ و ئەڵماس و پلاتین و عەقیق
با هەمووی سامانی تۆ بێ گیانەکەم
باشە قەیناکا لە لام دڵ هەم جگەر
گشتیان بریانی تۆ بێ گیانەکەم
کەس نییە لەم خاکەدا بێجگە لە من
لایقی سەردانی تۆ بێ گیانەکەم

***

# لەگەڵ تۆ

له گوڵزارا كه دانیشتم لەگەڵ تۆ
هەچی داخێ هەبوو ڕشتم لەگەڵ تۆ
ئەوەی ناحەز بە دڵداری ئەمن بوو
بە تیری تانە من كوشتم لەگەڵ تۆ
كەسێ لاف هەوا خوازی ئەتۆ بوو
خولاندم من لەسەر مشتم لەگەڵ تۆ
گوڵی تۆزاوی باخی خۆشی لای چەم
بە ئاوی عەتری تۆ شۆشتم لەگەڵ تۆ
لە شاخی بەرزی شادی دێمە خوارێ
خەریكی گەشتی ناو دەشتم لەگەڵ تۆ

١٩٦٠/١١/١٢

***

# بۆ لای ئێمە لادا

نیگارم دی کە سواربوو بوو لە لادا
ئومێدم وابوو بۆ لای ئێمە لادا
بەڵام خاوەنی لادا نارەسەن بوو
کە شیری ناکەسی کردبوو بەلادا
دڵم خۆش بوو کە یار میوانی من بێ
بەڵام ئەو لاوە ئامانجی بە بادا
لە خوام داوایە ئەو ناپاکە بمرێ
لە گۆڕستانی پاکی کەربەلادا
کە من ئەمڕۆ ژیانم زانی توش بوو
کە بادەش شادیەك بەم گیانە نادا
هەتا ماوم دڵم لەم کارە پەستە
ئەمێنێ کارەساتی وام لە یادا

١٩٨٢/٥/٢٥

***

## دڵی سەر لێ شێواو

دڵ وێنەی هەنگی سەر لێ شێواوە
چۆتە سەر دڕك لە گوڵ لایداوە
وا دەمی تیژی دڕك ئەمژێ
نازانێ تیژی دڕك ئەیكوژێ
دیارە گوڵی جوان دەمی كردەوە
وا مەیلی بۆ لای دڕك بردەوە..
هەركەس دڵداری كە لێ ی بێزار بێ
ئەشێ ژیانی هەر تار و مار بێ
ناچاری ئەكا دڵی سەرگەردان
خۆی كە بخاتە دەریای دەرد و ژان

٢٨/ مایس/١٩٨٢
***

## مەرگ و دڵداری

دڵداری لە مەرگ زیاتر بەهێزە
بەڵام بۆ کەسێك مەرد و بەرێزە
نەوەك لای ئەوەی کە خۆ هەڵکێشە
هەموو ئامانجی پێکی سەر مێزە
دڵداری مافی پیرۆزی گیانە
دڵداری شوعلە و بەهرەی ژیانە
خۆشی، سەرخۆشی، ئاشتی گشتی
لە دڵداریا بێ شك نیهانە

١٩٨٢/٦/٦

***

## تەنها تۆ

لە بێ دەنگی ئێوارانا
لە شەوەزەنگی ژیانا
کەوا ڕووناکی نامێنێ
یادی تۆم ماوە لە گیانا
لە گەردەلول و با رەشا
لە بەفر و ساردی سێ شەشا
لە گرمو هوڕی گوللەشا
تۆ ئەبینم یاری زانا
لە هەر کاتی سەرخۆشیا
لە ناخۆشی و بێ هۆشیا
لە دەروونی پڕ جۆشیا
ناوی تۆم وا لە زوبانا

١٩٨٣/٢/٣

***

## تۆم بۆ چ خۆش ئەوێ

گیانە ئەزانی تۆم بۆ چ خۆش ئەوێ
دڵم لە دنیا تەنیا تۆی ئەوێ
گەلێك توشم دێن جوان و عیشوەدار
هەر بە نیگای تۆ دڵم ئەسرەوێ
وەکو مردوو بووم زیندوو بوومەوە
کە میوانم بووی هەر تاقە شەوێ
وەکو فریشتە ئاگادارم بی
کۆشکی ژیانی بەرزم نانەوێ
گیانلەبەر هەموو بۆت دێن بە چۆکا
لە رۆژهەلاتا کە ڕووت دەرکەوێ
هەستی تۆ چونکە بەرز و باڵایە
هاودەم کە زانا نەبێ ناتەوێ
قسەی ناحەزی ناکەسی بەدخو
کارم لێ ئەکا بەقەد بڕنەوێ

١٩٨٢/٦/٢٠

***

## تیری تانه

بۆ تیـری تـانەی وا بوومە نیشان
تـان و پۆی ژینـی منی هەڵوەشـان
دێـوی نەگبەتـی سواری شانـم بوو
ئەژدەهای خەفەت خۆی بۆ دڵ کشـان
ئەو یـارە بە من کە فـەرمـان بدا
بەردی ئـەزمـڕی بۆ دێنـم بە شـان
هـەرچەنـد بە تاپۆ هی منیش نییە
پێشکەش ئەکەم قامیـش و قەشـان (*)

ئەوانـەی کـەوا نـاحـەز بە تۆ بوون
لـەبـەر بـەدکـاری هەموو داوەشـان
فریشـتـەی یەزدان ئەمڕۆ تـۆیـان دی
لـە باغـی شـادی وێنـەی گوڵ گەشان

(*) قامیش و قەشان: ( دوو دێ) ن لە نزیك ماوەت
***

## تاکەی بناڵم

بۆ دیدەنی تۆ تا کەی بناڵم
دڵت ناسووتیٚ گیانە بە حاڵم
تۆم دی بە ڕیٚکەوت لە باخی پاشا
شیٚوەی شیرینت وا لە خەیاڵم
من بۆت ئەنووسم لەسەر دڵی تەنگ
کە ژەنگی غەمی من پیٚ بماڵم..
هیٚز لە ئەژنۆم دا هەرگیر نەماوە
ئای بۆ دڵسۆزیٚ دەست باتە باڵم
کە تۆم لیٚ دووری بۆچیمە سامان
قوربانی تۆ بیٚ سامان و ماڵم
ساتیٚ بیٚرە لام هەتاکو ماوم
شیرینی بکە ژیانی تاڵم
تا هیٚز بخەیتە گیانی لەرزۆکم
بزانم بە هیٚز ڕۆستەمی زاڵم

٤ تموز ١٩٨٢

***

## تۆم خۆش ئەوێ

من تۆم خۆش ئەوێ بە دڵێکی پاك
ئەبێ بم بینی بە مرۆڤی چاك
تەنها ئامانجم دیدەنی ڕووتە
لێم ئاگادارە خودای تەنیا و تاك
لەلام دانیشە تاقە نیو سەعات
رووناك بێتەوە با دڵی غەمناك
ئەگەر بۆ لای من تۆ مەیلت هەبێ
ئەسووڕێمەوە دڵشادو بێباك
گەر خوانەخواستە لە من دڵگیربی
چاری دڵ ناکا نە مەی نە تلیاك
ئەو نالەبارەی دڵی تۆی ڕەنجان
وا ئەتلێتەوە وەك سەگ لەسەر خاك
کە تۆم دی ئەمڕۆ لە ناو گوڵزارا
زوو هاتم بۆ لات چاپووك و چالاك

٢٥/ تەموز /١٩٨٢
***

# لە هەر لا

کە تۆ دووربی پەرێشانم لە هەرلا
خەریکی ئاخ و گریانم لە هەرلا
کە دەت بینم ئەجووڵێ هەستی بەرزم
ژیانم شاد و بێ ژان لە هەرلا
کە بۆ لام هاتی گیانە پێت ئەبەخشم
هەموو دەسکەوت و سامانم لە هەرلا
لە بۆ تۆیە ئەگەر باوەڕ ئەکەی پێم
هەموو ئەشعارو پەخشانم لە هەرلا
بە تەنها چاوی من هەر تۆ ئەبینێ
ئەتۆی رووناکی چاوانم لە هەرلا
کە من جوانپەرستی کردەوەم بێ
هەژار و دوور لە تاوانم لە هەرلا

١٩٨٢/٨/٧
***

## لە ناو باخ

کە یار لێم رەنجا دوێ شـــەو لە ناو باخ
رۆییـم دڵ بـەغـەم هـەتـا لوتکەی شاخ
مـنـی بـێ تـاوان بـۆ چ وام بەسـەر هات
بـوومـە هـاودەمـی ئاهـو ئۆف و ئـاخ
لـەسـەر ئـەو شـاخـە بەرزە تووشـم بوو
لاوێـکـی شـۆخ و جـوان و بە دەمـاخ
وتـم پـێـم بلـێ هـۆی شـادمانـیـت ؟
چۆن وەك مـن نەبـووی تووشـی غەم و داخ
وتـی: گـیـرۆدەی ئـەویـنـی یـار نییم
بـەو پـیشـە پـووچـە خـۆم ناکـەم ناساخ
وتـم: تـۆ دیـارە خـام و نەفـامـی..!
کـە عـاشـق نـەبـیـت تۆ چیت قورمساخ

١٩٨٢/٨/١٦

***

# ناماقوڵیم کرد

که تۆم داگیر کرد ناماقوڵیم کرد
سەرم دا لە بەرد بێ ئوصولیم کرد
بۆ چ هۆش و هەستم واتێك چوو شێوا ؟
بەم گیانە پاکەی هەمبوو من چیم کرد ؟
زۆر پەشیمانم ئارامی گیانم
ئەگەر چی ژیرم من ناکەسیم کرد
بم بەخشە توخوا کە تاوانبارم
لاسایی پیشەی یەك سەرسەریم کرد
دیارە لێم خۆش بووی سوپاس بۆ خودا
لە چاوەکانتا ئۆخەی بە دیم کرد

١٩٨٣/١/٢٩
***

## با نەبێ

ئـەم ژیانـە دەرد و ژانـە بـا نـەبــێ
ئـەم گیانـەش بۆ نەمانە با نەبێ
گـەر نـەگـاتـە تۆ فریشـتـەی ئاسـمان
ئەو فریشتەی ئاسمانە با نەبێ
هـەرچـی تۆی ناوێ بە یەزدانی ئەوین
نالـەبار و هـیـچ نـەزانـە بانـەبـێ
هەرکەسێك دەرحەق بە تۆ فیزی هەبێ
گـەرچـی ئاغا و خانەدانە با نەبێ
من لە تـۆ دووربـم ئەخـۆم تالاوی غەم
گـەر وەهـابـێ ئەم ژیانە بـانـەبێ
ئـەو کـچـەی لافی جـوانـی لـێ ئەدا
شۆخی کانی ی عاشـقانە (*) با نەبێ

١٩٨٣/٢/٧

(*) کانی ی عاشقان: کانیەکە لە هەڵەبجە

***

## حەرامە پێم

یەکێ لەو پرتەقاڵەی بانی سنگت
بدە بەم عاشقەی ژیر و گرنگت
بە نەرمی ئەیگوشم ئەو پرتەقاڵە
ئەوی کەشیان بەقوربان بیخە چنگت
ئەتۆ ڕۆژی لە ئاسۆی ژین هەڵاتووی
بدە بۆ گیانی ئێمە سا گزنگت
لە هەر لاوە تەماشاکەر کە جەم بوون
ببینن جوانی بێ وێنە و زرنگت
ئەمن ڕۆح پاك و چاکم خوا ئەناسم
حەرامە پێم گوشینی مەمکی تونگت

١٩٥٥/٨/١٥
***

## بەیانی زوو بوو

چوومە لای نیگار بەیانی زوو بوو
دیدەنی روویم زۆر ئارەزوو بوو
بەڵام داخەکەم لەویٚ نەبوو یار
بۆ زیارەتی گۆڕستان چو بوو
لەویٚ دانیشتم هەتا هاتەوە
هێندە گریابوو چاوی سوور بوو بوو
دڵم هاتە جۆش کە بەم جۆرە دیتم
هۆشم لە بیرو ژیری ماندو بوو
پرچی شێوابوو بە شان و ملیا
ئەوەی جوان مابوو گەردن و ڕوو بوو
لەگەڵ ئەم شێوەی وا شێواوەشا
بەرامبەر بە من زۆر شیرین خوو بوو

١٩٨٣/٢/١٢

***

## چوومە لای

چوومە لای نیگار دیم کە نوستبوو
لەسەر چەرپایەك جێی ڕاخستبوو
کوڵمی وەك چرا وا درەخشان بوو
بە قردێلەی سوور پرچی بەستبوو
تەشی دانابوو زۆر نزیك لە خۆی
باقڵ بۆ بلوز ڕیسی ڕستبوو
زوو لە خەو هەستا چاو خەواڵو بوو
دەنگی پێی منی هەڵبەت بیستبوو
ناحەزی ناپاك کەوا توشم بوو
وەك سەگ بە تانە دڵی گەستبوو
داواکاری یار جێ بەجێ کرا
بۆم ئامادەکرد هەرچی ویستبوو

١٩٨٣/٢/٢٠

***

# دڵنیا بە.. !

دڵم بۆ تۆیە تۆ دڵنیا بە!
ئەگەر درۆم کرد لە من جیا بە
گیانە بڕوات بێ بە دڵپاکی من
وەك من بە وەفام تۆش بەوەفابە
قەت فریو مەخۆ بە واتەی نەرم
ئەگەر چی ژیری بەڵام وریابە
هەڵت ئەبژێرن بە خوای جوانی
هەر تۆ تاقانەی زۆر بە هیوا بە
مەترسە ئێمە تۆ ئەپەرستین
بڕوات پێمانە ئەو ترسە لابە
کەسێ لەگەڵ تۆ خوار و لاری کرد
یا شێتە یاخود مەستی شەرابە

١٩٨٣/٣/١

***

## مەکەن باس

لە دڵـداریا تـەمـەن مـەکـەن باس
هـەتـا نـەبـم مـن لـەم کارە هەراس
تـەمـەنـم زۆرەو دڵـیـشـــم لاوە
سـەری خۆم نـاکەم لـەم کـارەدا کـاس
سـەیـری مێشك و هۆش و هەسـتـم کەن
کە من خۆم نادەم بە (هەیاسـی خاس)
ئـەو جـوانـەی کـەوا ژیـیـر و زانایـە
تـەفـرە نـادرێ بـە کـەوا و کـراس
کێڵگەی ژیـانـم زەرد نەبووە هێشتا
لـە بۆ درویـێنــەی گـەرەك نـیـیـە داس
پـیـشـەی دڵـداری بـەرز و پـیـرۆزە
بـە نـرخـتـرە لـە کـانـی ئەڵمـاس

١٩٨٣/٣/١٢

***

# ڕۆژی نەورۆز

ئەمڕۆ زۆر خۆشە ڕۆژی نەورۆزە
ڕۆژێکی یەکجار بەرز و پیرۆزە
لەت لەت کراوە دێوی دڵ تەنگی
تەنها بەد بەختی لە غەم ئاڵوزە
بەڵام نازانم ئارامی گیانم
بۆ چ وەکو منداڵ ئەمڕۆ گڕۆزە ؟
رەنگە لە دایکی دڵی ڕەنجا بێ
ئەگەرچی بۆ ئەو گەلێ دڵسۆزە
خۆت دەرخە وەکو ڕۆژی ئاسمان
چاوەڕوانی تۆن ئەم گەل و هۆزە
گەر بچیە سەرکەل من هەر دێمەلات
گەرچی ڕێگاکەم هەر تەپ و تۆزە
من ئەو دیمەنەم چەندە لا جوانە
ئەچیە سەرکانی هەڵ ئەگری گۆزە
لەبیرت ماوە چۆنم تەمێ کرد..!
کە ڕێی پێ گرتی کابرای بۆزە
ئەوەی من لە تۆ گیانە گەرەکمە
ئاوازی خۆش و دەنگی پڕ سۆزە

١٩٨٣/٣/٢١

***

# نەمامی جوانی

نەمامی جوانی ی دڵداری لە ناو دڵما چەقانوومە
هەموو فرمێسکی غەمباری بەسەر رووما ڕژانوومە
درەختی ژینی من ئەمڕۆ لە چۆڵا وشك و بێ ئاوە
گەڵای زەردی لە داخا وا بە دەستی خۆم وەرانوومە
بە بادە ئارەزووم وابوو کە خەم لادەم لە ناو دڵما
بەڵام پەرداخ و پیاڵەی مەی بەبێ هۆشیی شکانوومە
لە ڕووت و قووتیا ڕووم نایە بێمە ناو کەس و یاران
بە پەنجەی شومی بەد بەختی هەچی جلمە دڕانوومە
کە من بێ حاڵ و ماڵ و لانەوازم پەست و سەرسامم
نییە تیا بسرەوم ماڵێ، مەگەر مەیخانە خانوومە
سەرم لێ تێك چووە وا هاوسەرم زوو کۆچی دوایی کرد
ئومێدی خۆشی ژینم وا لە ناو گۆڕا نوانوومە
***

# دڵی عاشق

دڵــی عـاشـق چاوی هەیە

هەستی زۆر تەواوی هەیە

هەرچی کارێ کە یـار ئەیکا

لە لای عاشق باوی هەیە

یـار بـێ نـاو بێ خانەدانی

لای ئەو باشتر ناوی هەیە

دانەی خاڵی کوڵمی جوانـی

بــۆ دڵی مـن داوی هەیە

ئەوەی زۆر دڵســۆزی ئەوە

هــەرمنـی داماوی هەیە

١٩٨٤/٩/٤

***

# ئەدەم بە با داخەکەم

ئەی کچۆڵەی جوان و شیرین با بە بادەم داخەکەم
ببمە قوربانت لەبۆم ئامادەکە پەرداخەکەم
لەم ژیانە، لەم جیهانە شادی یە ئامانجی من
هەر لەسەر ئەم هەستە پاکە هەڵ ئەدەم بەیداخەکەم
دەستی من گیانە بنێرە ناو دەستی نەرم و شلت
با لە ناو دڵ یا دەروونا دەربەدەربێ ئاخەکەم
من بە بێ رووی تۆ ژیانم نەرخ و رێزێکی نییە
بۆ هیوای پڕ شادمانی تۆی گوڵی ناو باخەکەم
وا بە ناو دەشتی هەژاری دا ئەڕۆم سەودا سەرم
جا لەسەر فەرمانی دڵ من روو بە لووتکەی شاخەکەم

١٩٨٣/٨/١١

***

# چی لە من ئەکەی

لە کوشتن زیاتر چی لە من ئەکەی
باقل مێشك و دڵم کون ئەکەی
بەهۆی شیعرەوە کەمێ ناسراوم
بۆ چ لە نێوانا ناوم ون ئەکەی
من بۆ تۆ هەردەم دوعای خێر ئەکەم
تۆ بۆ من دوعا بۆ مردن ئەکەی
هەموو کەس زانی تۆ چیت بە من کرد
چۆن حاشا گیانە لە کوشتن ئەکەی
لەگەڵ هەموو کەس کردەوەت باشە
تەنها ناباشی لەگەڵ من ئەکەی

١٩٨٤/٦/٢٨

***

# دڵ دزین

ببمە قوربانی دوو کولمی جوان و لێوی قرمزیت
تۆ کە پیشەت دڵ دزینە بۆ چ دڵی من نادزیت
من سەرم سوڕما لە جوانی سنگ و مەمك و گەردنت
تۆ گوڵی باخی بەهاری یاخو خونچەی پایزیت
با هەموو شۆخانی عالەم بێنە لای تۆ بۆ گرەو
تۆ یەکەم جوان دەرئەچی لەم کارەدا قەت نابەزیت
ئاهی پڕ تینی هەناسەم گڕ لە ئەزمەڕ بەرئەدا
تۆش کە خوێنت هێندە گەرمە قەت لە بەفردا ناتەزیت
من لە گەشتی دەشتی ژینا ئاخری ڕاوت ئەکەم
گیانە ڕاوچی شارەزام من تۆش بە وێنەی مامزیت
خۆزگە بەو ڕۆژەی کەوا لێم تووڕەبووی کاتی بەیان
سەیرە لام بۆ چ وا لە ئەسپی هۆش و ژیری دابەزیت
ناحەزانی تۆ لە لای من ئاشکرایە بێ گومان
تۆ گوڵی باخی بەهەشتی یا فریشتەی (یولدز) (*) یت
(شاری) تۆ هاوبەزمی یارانی لە باغ و گوڵشەنا
ئاخۆ چی رووی داوە ئەمڕۆ بۆچی سەرسام و کزیت

١٩٨٣/٤/٢٤

(*) یولدز: قەسری سوڵتانەکانی عوسمان بوو لە شاری ئەستەمبول لە تورکیا

***

# پێی نەزانیوە

پێی نەزانیوە کە من دڵبەندی ڕووی جوانی ئەوم
پێی نەزانیوە بە ڕۆح و دڵ پەرێشانی ئەوم
پێی نەزانیوە کە کاتێ سەیری روخساری ئەکەم
ڕووی کە وەك ڕۆژە لە زومرەی ڕۆژ پەرستانی ئەوم
ئەو بەڕۆڵەی خۆی ئەڵێ من ببمە قوربانی دڵت
پێی نەزانیوە منیش هەروا بەقوربانی ئەوم
من کە هەر چەندە ژیانم نەرخ و تامێکی هەیە
گەر قبوڵی کا هەتا هەم عەبدو دەربانی ئەوم
ئێمە مەیل و ئارەزووی زۆر خۆشی بریانی و کەباب
من کەوا ڕۆحم فیدای بێ سینە بریانی ئەوم

١٩٨٣/٥/٤

***

# لێوم گەیاندە لێو

لێوم گەیاندە سەر کوڵم و لێوی
دەستم گەیشتە لای جوتە سێوی
بە خۆشی ماچی کوڵم و لێوم کرد
سێویشم گوشی بە بێ بزێوی
لەگەڵ نیگارا ئاشت و هاوڕازین
دوورم لە قین و تانە وجنێوی
ئەوەی ناحەزی من و یارم بوو
ئەجوولا وەکو ئاژەڵی کێوی
ئەم حاڵەم ئێستا لەگەڵ نیگارا
خوایە بی هێڵی بەبێ پەشێوی

١٩٨٤/٨/٣٠

***

# بۆچی وا تۆرا لە من ؟!

پـێی بڵێن بەو یارە جوانە بۆچی وا تۆرا لە من
من گەلێ بڕوام بەهێزە قەت دڵی نەشکا لە من
ئێستە بیرم کەوتەوە دوێ شەو وتم روومەت گوڵی
هەر لەبەر ئەم واتە لاتە ئەو دڵی ڕەنجا لە من
مـن کە ڕۆژ و شەو لە قەسرا یارو هاوبەزمی ئەوم
بۆ شتێکی وا بچووك ئەو حەق نییە لادا لە من
خۆ ئومێدی شادی ژینم لەم جیهانە هەر ئەوە
چاك ئەبێ هەستی ئەگەر چی زیزە ئەو ئێستا لە من
کەس نییە وەك من بزانێ هاودەمی یاری جوان
من کە دڵبەستەی ئەوینم بۆیە سڵ ناکا لە من

١٩٨٣/٥/٢١

***

## دڵداری بێ دەنگ

دڵداری بێ دەنگ هەر بە چاو ئەکرێ
زۆر بە خشپەی ئاسك ڕاو ئەکرێ
یارێ سەرکەش بێ لە دڵداریا
چاری سەرکەشی هەر بە داو ئەکرێ
ئەو یارەی کەوا تووڕە و ناسازە
بەقسەی نەرم و شیرین خاو ئەکرێ
ئەشێ پێی بڵێن یاری خۆ فرۆش
ئەوەی بە زێڕ و پارە تاو ئەکرێ
یارێك خەڵەتا بە درۆی بەدکار
لە دنیای ژینا زوو بەدناو ئەکرێ
ئەو یارەی کەوا ڕەوشتی پاکە
لە جارێك زیاتر سەد سڵاو ئەکرێ

١٩٨٣/٦/١٩

***

# هەستە ڕاوەستە

هەستە ڕاوەستە با تەماشات کەم
سەیری ڕوومەت و بەژن و باڵات کەم
ئەوسا دانیشە لەسەر ڕانەکەم
تێروپڕ ماچی دەم و گۆنات کەم
دڵم پێداوی خۆت ئاگاداری
دەبا ڕۆحیشم بە تۆ خەڵات کەم
هەرچی کە هەمە لە ماڵ و سامان
لەگەڵ ژیانما گشتی فیدات کەم
هەرتۆ سەرمایەی بەختیاریمی
ئیتر بۆ چ لە دەس بەختم شکات کەم
خوا بە تۆی بەخشی تاجی جوانی
بۆ عەرشی جوانی بۆ چ بە تەمات کەم
هاتی بەخێر بێیت، خۆ گەر نەشهاتی
نابێ من باسی هات و نەهات کەم

١٩٨٣/٦/٢٦

***

# چاوەکانت

فیدات بم چاوەکانت دڵ رفێنە
دڵی من چاوەڕوانە لێم بسێنە
بە شێواوی جوانە پرچەکانت
بە قوربان سا بە شانە دای مەهێنە
وتاری تۆ وەکو گەوهەر بەنرخە
بەڵام دایکت وتاری دڵ شکێنە
کە تۆم لێ دووربی ئەگریم چەشنی ساوا
هەموو فرمێسکی چاوم سووری خوێنە
هەموو پەیمانی تۆ یاسای ژیانە
درۆیان فەرموو گوتیان بێ بەڵێنە
سەرم سوڕما لە ئاڵی کوڵم و لێوت
لە جوانیدا نیانە چەشن و وێنە
ئەگەر گوڵ هات و لافی جوانی لێدا
بەپەنجەی خۆت پەڕەی گوڵ هەڵوەرێنە

١٩٨٣/٧/١

***

# ماندوو ئەبم

کە شوێنت کەوم زوو ماندوو ئەبم
ئەو کاتە خۆشە ڕوو بە ڕوو ئەبم
من دوور بە دووریش کە تۆ ئەبینم
مەستێکی خۆشی زوو بە زوو ئەبم
وادەم ئەدەیتێ گیانە دێمە لات
خێرا ئاشنای ئارەزوو ئەبم
فەرمووت ئەمەوێ هەر من و تۆ بین
هاوڕازی بەزمی دوو بە دوو ئەبم
منیش ئەو کارەم لە یەزدان ئەوێ
گەر سەرکەشی کەم من بەدخوو ئەبم
لە ڕێی دڵداری تۆی بێ وێنەدا
باسی سامان کەم چەشنی جو ئەبم
گەر خۆت نیشاندەی بە تاقە یارم
سەرۆکی بەرزی لای سەرو ئەبم

١٩٨٣/٧/٨

***

## تۆم خۆش ئەوێ

من تۆم خۆش ئەوێ بێ هیچ مەبەستێ
هەستم لە ڕێگای پاکا ئەوەستێ
دڵم زۆر پاکە بەرامبەر بە تۆ
قەت بڕوا مەکە بۆت بەرم دەستێ
لە دڵ بەخشانی دنیای ئەوینا
کەس نییە وەك من بە پاکی هەستێ
لەوانەی کەوا گیان فیداکارن
نییە کەس وەك من جوان پەرستێ
واتە و قسەی من بەرامبەر بە تۆ
هەمووی بناسە ڕاست و دروستێ
بە قسەی درۆی شێخ بڕوا مەکە
بڕوات چاکتر بێ بە واتەی مەستێ

١٩٨٤/١/٧

***

## یارم نەخۆشە

ئەمرۆ نەخۆشە یارە جوانەکەم
بۆیە تاڵ بووە لام ژیانەکەم
پەرچەمی رەشی جوانی شێواوە
بە وێنەی گیانە پەرێشانەکەم
چومە خزمەتی هەواڵم پرسی
وتم فیدات بێ رۆح و گیانەکەم
چییە ناساغی ئەندامی جوانت
بمرم گەر دەوات بۆ پەیدا نەکەم
ئێستا پزیشکت من لە بۆ دێنم
بۆتی سەرف ئەکەم گشت سامانەکەم
بە گریانەوە جوابی دامەوە
وتی لە گیانما زۆرە ژانەکەم
ئەترسم بمرم هەروا بەجوانی
بەرگی بوکێنی بە بەرما نەکەم
وتم گیانەکەم وا رەشبین مەبە
ئومێدم زۆرە بە یەزدانەکەم
چاک ئەبیتەوە چاکتر لە هەرکات
من رۆحی خومت بە قوربان ئەکەم

١٩٨٤/٣/٢٢

***

## خۆشیی ژین

که نەختێ خۆشیی له ژین ئەچێژم
لـه باخچەکەیا نەمام ئەنێژم
وازم هێنـاوه لـه هـەرزه بێژی
شیعر و وتاری به نرخ ئەبێژم
به نووکی تیژی شمشێری شادی
خوێنی ناپاکی خەفەت ئەڕێژم
که یار ئەبینم هەر ڕۆژی جارێ
وەك مەستی باده دەبەنگ و گێژم
عومرێکی کەمی شادی خۆشتره
کەوا ناحەزی عومری درێژم
***

# دڵم ڕووناکە

کە لام دانیشی دڵم ڕووناکە
کاتێ ڕۆیشتی پەست و خەمناکە
ئەگەر بۆ خەندە دەم بکەیتەوە
دڵشادم ئەکەی ژیانم چاکە
ئەو دەمەی قسەم لەگەڵا ئەکەی
هەستم بۆ خۆشی تاقانە و تاکە
تۆ پارچەیەکی لە گیان و رۆحم
بۆیە وا ڕۆحم خاوێن و پاکە
لەبەر تۆ ماوم... لەبەر تۆ ئەژیم
دڵم لە عەشقی ڕووتا چالاکە
پێم بیژە کابرای دڵبەندی ئەوین
بە قوربانت بم پێم مەڵێ کاکە

١٩٨٤/٣/٣٠

***

## من نیازمە

ئەو کچە جوانەی کە دڵخوازمە
بۆ ماچی دەمی من نیازمە
ئەو نەو نەمامەی دڵی لێ سەندووم
بە ڕۆح و بە دڵ ئەو هاوڕازمە
کاتێ ئەی بینم وە  یا دێتە لام
زۆر مەیلی بەزم و سۆز و سازمە
بەسەر زەمینی پەستا نافڕم
بۆ عەرشی یەزدان من پەروازمە
بەهەموو کاتێ ناوی تۆ دێنم
یاران ئاگایان لە ئاوازمە

١٩٨٤/٤/٢

***

# نیگارێکم ئەوێ

نیگارێکم ئەوێ شیرین و جوان بێ
قەد و بالای وەکو سەروی ڕەوان بێ
لە خۆیا خانەدانی ئاشکرا بێ
نەوەك باپیر و بابی خانەدان بێ
هەموو رۆژێ دو سێ جار خۆی ئەگۆڕێ
لە ناو مالا بەرێز و خان و مان بێ
لە واتەی دایك و باوك و کەس نەتۆرێ
لە کرداری هەڵەی تێدا نەبینرێ
لە هەر کارا گەلێ نەرم و نیان بێ
دەمی پڕ خەندە بێ هەر کات و ساتێ
لە قاقا و جرت و فرتا بێ نیشان بێ
لەگەڵ خەنفووسی لوسا رانەوەستێ
سروشتی وەك فریشتەی ئاسمان بێ
بە بۆیە سوور نەکا قەت کولم و لێوی
ڕەوشتی پاك و خاوێن و گران بێ
ئەگەر بێ وانەبێ هەر نەو نیگارێ
ئەشێ دوو چاری ئازاری ژیان بێ

١٩٨٤/٤/١١

***

# لە ناو شەمەندەفەرا

لە ناو فارگۆنی شەمەندەفەرا
ئەمشەو تووشم بوو یەك روومەت چرا
ئەمن بە کوردی ئەو تورکمانی
لە دنیای عەشقا تەفاهوم کرا
وتم: ماچێکم ئەوێت لە کوڵمت
زۆر بە ئاسانی ماچم پێ درا
کە گەیشتینە شاری (جەلەولا)
لە دڵداریا پەردە لادرا
وتی: زوو زانیم کە تۆ شاعیریت
زۆر چاك ئەو شۆخە بە من ناسرا
کە شەمەندەفەر گەیشتە کەرکوك
خۆمان نیشان دا وەك خوشك و برا
ئەو وتی: بای بای، من وتم: وای وای
ئەو خەوە چی بوو ئەمشەو بینرا

## ١٠

لە جوانانی سولەیمانی و هەڵەبجە
لەلای من گیانەکەم هەر تۆ پەسەندی
لە لادانی هەموو ئەم شارە خۆشە
بەقوربان پێم بڵێ دڵبەندی چەندی
هەموو خەنفوس و کەم هۆش و نەفامن
مەگەر گیانە بە ڕەنگ و شێوە بەندی
لە تۆ پاڕایەوە ناحەز لە بۆ ماچ
دڵم خۆشە کە ماچی لێ نەسەندی
لە من پرسە قسەی پڕ نەرخ و ڕاستی
گەلێ بالأیە ((شاری)) شیعر و پەندی

١٩٧٦/٨/٢٨

***

# ئەوەی پێکەنی

ئەوەی پێکەنی بۆ یەك جریوە
پەڕی تاوسی دیارە نەدیوە
ئەوەی بێ هونەر کە خۆی هەڵکێشا
لە نەفامیا بێ شك چەقیوە
هەندێ کەس کەوا گۆرانی ئەڵێن
خۆیان بە خاوەن هونەر ناسیوە
ئەوەی بە شاعیر خۆی نیشان ئەدا
بەبێ توانا ڕێگەی بڕیوە
پیاوی سەرسەری سەرمایەی دەستی
کرداری پیسە و قیزە و قریوە
ئەو مەلەی کەوا ون ئەکا لانەی
پەست و بێ فەڕە غەلەت فڕیوە
ئەوەی بە درۆ ژین بەسەر ئەبا
بەرگی ناپاکی بە ژین دڕیوە
ئەوەی کە ڕێگەی چاکی ون ئەکا
لە ناو تەویلەی ژینا بەزیوە
ئەو درەختەی وا بێ خێر و (زڕ) بێ
ئومێد ناکرێ (لەو) بەر و میوە
لاوی نالەبار باوکیشی مابێ
ناو و کرداری چەشنی هەتیوە
ئەو بازرگانەی بێ سەرمایە بێ
لە فێڵ و حیلە قازانجی دیوە
ئەوەی بەدبەختی دۆست و یاری بێ
تان و پۆی ژینی بە ژان تەنیوە
١٩٧٥/٤/٢٩

## نابم.....

ئەمەویٚ شیٚری شەرزەبم نابم
قارەمانی ئەم ئەرزە بم نابم
ئەمەویٚ هەر بژیم بە بیٚ باکی
سارد و سڕ چەشنی تەرزەبم نابم
ئەمەویٚ دۆستی هەر کەسانیٚ بم
هاودەمی خام و هەرزە بم نابم
ئەمەویٚ دوور لە کۆسپ و نزمی بم
لەسەر ئەو کیٚوە بەرزە بم نابم
ئەمەویٚ ناکەسان بترسیٚنم
هەروەك بوومەلەرزە بم نابم
ئەمەویٚ هەر بەهار و خۆشی بیٚ
یاری ئەم تاقە وەرزە بم نابم
ئەمەویٚ کات و ساتی دڵداری
بە نیگای یار شپرزە بم نابم
ئەمەویٚ نەچمە شار و جیٚگەی دوور
لەسەر ئەم خاك و ئەرزە بم نابم
ئەمەویٚ بادە نۆشی پیشەم بیٚ
لەگەڵ ئەم ڕەنگ و تەرزە بم نابم

١٩٧٥/٥/٥

***

# هەرچی خاوەن پارەیە

وامەزانن دەوڵەمەندە هەرچی خاوەن پارەیە
زۆر هەیە پارەی بە لێشاوە بەڵام بێ چارەیە
ماڵی خۆی ناچێ بەدەمیا ڕۆح و چاوی برسی یە
ئەو لە کۆمەڵدا گەلێ بێ نەرخە یا پەتیارەیە
پارە بۆ خۆشی ژیان سەرف نەکەی کەڵکی چی یە ؟
دەستی قوچا هەرکەسێ، بێ حورمەت و بێ کارەیە
پارە گەر سەرف نەکەی فەرقی لەگەڵ خۆڵا چییە ؟
زۆری وا هەن دەسنیشانی خەڵکەکەی ئەم شارەیە
ئەو شتەی لەم کارە وا داخی دەروونم لا ئەبا
دەنگی نای و تار و عوود و عارەقی دوو بارەیە

١٩٧٦/٧/١٠

***

# پیر کە ماندو بوو

پیر کە ماندوو بو وچانی ئەویٚ
گەر قاچی ئیٚشا گۆچانی ئەویٚ
ئەگەر برسی بوو گیانی ئەلەرزیٚ
کەبابی گۆشتی بەرانی ئەویٚ
نەخۆش بکەویٚ لە ناو جیٚگەدا
دکتۆر و فەحس و دەرمانی ئەویٚ
بۆ مالٚی دنیاش زۆر بەپەرۆشە
بەرزی و کەشخەی ژیانی ئەویٚ
بۆ کەس و کار و مالٚ و مندالٚی
ڕیٚز و دلٚشادی و سامانی ئەویٚ
بۆ گشت ناحەز و دوژمنی ناپاك
ئازار و مەرگ و فەوتانی ئەویٚ
لە خوای داوایە کە گەنج بیٚتەوە
ژینی زۆر خۆش و شادانی ئەویٚ
بۆ ئەو مرۆڤەی پیس و ناپاکە
ڕەشمە و قەیاسە و کورتانی ئەویٚ
بۆ هەموو کچ و ژنیٚکی ڕوو جوان
خەندە و ڕووخۆشی و سەیرانی ئەویٚ
بۆ چارە ترش و تالٚ و نالەبار
دووری و ڕەنجوری و نەمانی ئەویٚ
ئەو کەسەی کەوا ولاٚت فرۆشە
تف و لەعنەتی شەیتانی ئەویٚ
بەلاٚم لە بۆ خۆی (شاری) بەسزمان
تەنها ڕەحمەتی یەزدانی ئەویٚ

***

# بەختەکەی ڕەشم

نووسرا لە تەختەی بەختەکەی ڕەشما
نەما ئازادی و شادی لە بەشما
هەندیٚ کەس کەوا پێم ئەڵێن ئاغا
موچڕکەی ناخۆش من دیٚ بە لەشما
باخچەی ئومێدم چڵی وشك بوو
نە بولبولی جوان نە گوڵی گەش ما
عیزرائیلی غەم وا لەسەر دڵم
کۆرپەی نەگبەتی وا لە باوەشما
عەشقی دڵداری کە بەد میزاجە
ناگونجیٚ لە تەك دڵی بیٚ غەشما
لە نەردی ژیان من هەر دۆڕاوم
شەش دەر گیرا بیٚ چلۆن دووشەش ما
لە دنیا هەمبوو دڵێك و گوڵێك
نە ئەمیان ماوە خۆ نە ئەوەش ما

١٩٧٦/٧/٢٣

***

## هەمە جۆرە..

ڕۆژێ دڵشـادم ڕۆژێ غـەمـبـارم
ڕۆژێ زەنـگـینـم ڕۆژێ هـەژارم
ڕۆژێ بـاڵایە من تـەندروسـتـیم
ڕۆژێ نـاسـاغ و خـاوەن ئـازارم
ڕۆژێ بەدبەخت و پەست و نەگبەتم
ڕۆژێ ئـەمـبینی زۆر بـەخـتـیـارم
ڕۆژێ زۆر چاکم لەگەڵ هەموو کەس
ڕۆژێ ڕوو تـرش و زۆر نالەبارم
ڕۆژێك زیـرەك و خـاوەنـی بەرهەم
ڕۆژێك بێ مایەی ڕەنج بە خەسـارم
ڕۆژێ دەس ئـەخـەم پارە و ماڵی زۆر
ڕۆژێ ون ئـەکـەم دیـن و دینـارم
ڕۆژێك دوژمنـی دۆسـت و یـارانـم
ڕۆژێك گـیـان فیدای نیگار و یارم
ڕۆژێ هـاودەمـی هــەژار و لاتـم
ڕۆژێ هـاورازی سـەرمـایـەدارم
ڕۆژێك لـەبەر کـار لـەشم ماندووە
ڕۆژێ بـێ چـارە و بێ کار و بارم
ڕۆژێ شــاعـیرم بـەرزە شــعـورم
ڕۆژێ نـاسـازە شـیـعر و وتـارم
ڕۆژێ لـە تـرسـا گـیـانم ئەلەرزێ
ڕۆژێ ڕۆسـتـەم و ئـەسـفەندیـارم
ڕۆژێ لـە دەشـتـا ئـەسـوڕێـمـەوە
ڕۆژێ گـەڕۆکـی شـەقامـی شـارم
١٩٧٦/٧/٣١

# ساختەچێتی

ساختەچێتی بۆ هەموو کەس تاکو سەر سەرناگرێ
داری زڕ هەرچی لەگەڵ دا هەر بکەی بەر ناگرێ
ئاسنی ژەنگاوی بێ کەڵکە خەریکی بێ مەگەر
لێ ی گەڕێ قەت جەوهەری تیغی دەبان وەرناگرێ
بەرگی ئاوریشمی بە نەرخت مەیدەرە هیچ ناکەسێ
ڕاستە ئەو بەرگە کە کەڵکی شوان و مەیتەر ناگرێ
خۆت لەگەڵ هەرزە و نەفاما گیانەکەم ماندوو مەکە
کارەکەر هەرگیز ڕەوشتی جوانی شاوسەر ناگرێ

١٩٧٦/٨/٤

***

## ئەوەی نانێکی هەیە

ئەوەی بەبێ ڕەنج نانێکی هەیە
بەلام لە دڵیا ژانێکی هەیە
کەسێ لە ژیان کە بێزار ئەبێ
لە هۆی پەستی گیان کانێکی هەیە
سەد کۆسپی چەوتی ژینی بڕیوە
ئەوەی کە هیوای مانێکی هەیە
مەراق و خەیاڵ سەری لێ ئەدا
مەردێکی مێگەل ڕانێکی هەیە
ئەو ئاشەوانە دڵی زۆر شادە
لە ئاشەکەیا دانێکی هەیە

١٩٧٦/٨/١٥

***

# ڕەش سپی نابێ

ڕەش بێت بە سپی ئاخۆ بە تەمای ؟
ناکەس بێ بەکەس لەمە دڵنیای ؟
ئاشێك بێ ئاو بێ هەرگیز ناگەڕێ
مرۆڤ بە بێ نەوت ناسووتێ چرای
بە قسەی ناحەق گەر باوەڕ بکەی
لەگەڵ نەفامی دۆست و ئاشنای
گەر بێ بە هاوڕێ ی نەزان و ناکەس
زۆری پێ ناچێ وەك شووشە شکای
ئەگەر خۆت نەرخ و ڕێزت ڕانەگری
پاشکەوتوو ئەبی گەر نەوەی پاشای

١٩٨٣/٧/٧
***

## تاریکی دنیا

تاریکی دنیا گشت کۆبێتەوە
ڕووناکی مۆمێك ناشارێتەوە
هەموو هەتاوی هاوین و بەهار
یەك ڕەنگی سپی پێ ناچێتەوە
ئەوەی لە ئەسڵا کە بەد ڕەوشتە
لە کاری چاکە ئەسڵەمێتەوە
چاکی، خراپی بە شوێنا بکرێ
وەك بەفری هاوین زوو ئەتوێتەوە
خاوەنی چاکە ناوی ئەمێنێ
دەرگای ڕەحمەتی بۆ ئەکرێتەوە
مرۆڤی خراپ وەجاخ زادەش بێ
هەر زۆر بە سووکی ناو ئەبرێتەوە

١٩٧٦/٨/٢٠

***

## سەر لیٚ شیٚواوم (*)

لە دنیای ژینا سەر لیٚ شیٚواوم
هاوسەری ژینم ڕۆی لەبەر چاوم
منی بەجیٚ هیٚشت بە تاك و تەنیا
بیٚ تین و بیٚ هیٚز جگەر بڕاوم
هەر دیٚم دەچم بە ناو یانەدا
ویٚنەی پاساری دوور باڵ شکاوم
(ئەو) کە هاوڕاز و هاودەمی من بوو
وەکو قازی کویٚر بە تەنیا ماوم
هیچ کەسیٚ نیە کە فریام کەویٚ
لە ناو ئاگرا ئەگەر سووتاوم
کوڕ و کچ کۆیلەی ماڵ و مناڵن
ڕەنگە لەمەولا هەر نەبەن ناوم
قاپی دڵسۆزیم لیٚ داخراوە
ڕەنج بە خەسارچووی مایە فەوتاوم
ئەژیم لەمەولا وەکو جانەوەر
نەك وەك ڕابووردوو کەوا ژیاوم
هاوسەر گۆڕەکەت پڕ ڕووناکی بیٚ
هەر لە یادمی هەتاکو ماوم

١٩٨٣/٧/١٩

(*) ئەم هۆنراوەیە بۆ کۆچی دوای خیٚزانەکەی وتراوە
کە ڕیٚکەوتی ١٩٨٣/٧/١٦ کۆچی دوای کردوە

## شیننامە بۆ فەرهـاد (*)

کوڕی تاقانە تاقە سایەم بوو
بۆ بەرهەمی ژین ئەو سەرمایەم بوو
ئومێدم زۆر بوو کە باش دەرکەوێ
لە هەموو پلەی ژینا سەرکەوێ
ڕەوشتی پاك و ئاواتی چاکی
رزگاری بکا لە گشت غەمناکی
زۆر هەوڵی ئەدا لە بۆ گەلی کورد
من ئاگادارم هیمەتی ئەکرد
بەڵام داخەکەم بە دەستی ناپاك
خوێنی خاوێنی ڕێژرایە سەر خاك
ڕۆژی ئومێدم خێرا ئاوا بوو
بێ سەر و بەرما هەرچی داوابوو
کوڕم شەهید بوو لە ڕێ ی کوردستان
وا من ئومێدم نەما بە ژیان
ڕۆحی خاوێنی بە بەهەشت شاد بێ
لە ترس و پرسی ئەولاش ئازاد بێ
کوڕی شەهیدم جوانەمەرگ فەرهاد
هەتاکو ئەمرم تۆم هەر وا لە یاد

ئەوەی لە پێناو گەلیا فیدا بێ
ڕۆژی ژیانی قەت ئاوا نابێ
گەرچی ئەندامی لە ناو گۆڕایە
ڕۆحی زۆر پاکی لەگەڵ ئاگایە
شەهیدی وەتەن مەرتەبەی بەرزە
ڕێز لێ گرتنی واجب و فەرزە

(*) باوکی شەهید فەرهاد: علی عارف ئاغا (شاری)
١٩٩١ /٣/٢٩ هەینی
***

## بێ چارە نابێ

ئەوەی کاری هەبێ بێ چارە نابێ
ئەوەی هۆشی هەبێ بێ کارە نابێ
کەسێ هەوڵی هەبێ گەر بۆ ژیانی
بەڕێز و بەرزە قەت پەتیارە نابێ
ئەوەی بیری هەبێ خۆ بۆ دواڕۆژ
ئومێدی گەورەیە و ئاوارە نابێ
ئەوەی ڕاست و دروست و هەستی پاکە
لە ژین بێ ژانە قەت بێ پارە نابێ
کەسێ ئارەق بڕێژێ ناوچەوانی
تەمای بۆ ئارەقی دووبارە نابێ
ئەوەی دوور بێ لە مەیدانی سیاسەت
بەشی قەت بەندی یان سێدارە نابێ
ئەوەی خۆی خستە دوای فێڵ و حیلە
ژیانی خۆشی قەت لەم شارە نابێ
ئەوەی کرداری زانست و هونەر بێ
سەری هەر بەرزە قەت بێ چارە نابێ
لەژینا هەیبێ گەر هێز و ئیرادە
بە دەست باوە وەکو کۆلارە نابێ

١٩٧٦/٩/٢

***

## فیزی شاعیر

من مرۆڤێکم بێ فیز و هەژار
شیعر ناکەمە مایەی ئیعتیبار
خۆم هەڵناکێشم بڵێم شاعیرم
زۆر شاعیرێکی بەرز و ناودێرم
شیعر لە خۆیا کە زادەی هەستە
نەك بۆ دەسکەوتی هەندێك مەبەستە
ئەوەی بە شیعر کە خۆی هەڵکێشا
بێ فەرقە لەلام ئەو لەگەڵ مێشا
چونکە مێش پیشەی هەر گیزە گیزە
شتێکی پیسە و سووك و بە فیزە
یەکێك ئەزانم لەم شاعیرانە
خۆی وا ئەزانێ میری هەمووانە
کە خۆی گیڤ ئەکا وەکو بۆقلەمون
ئەڵێ هەر منم هاوتای ئەفلاتوون
بەلام لە شیعری کە وردبیتەوە
چەندە پیادەیە ئەیناسیتەوە
خوایە گەر منیش چوومە ریزی ئەو
گیانم دەربکەی کاتی نیوە شەو

١٩٧٧/٧/١٧

***

## ڕێز بۆ مامۆستا زێوەر (*)

گەر لە شیعرا کەم کەمێ خاوەن فەڕم
فەخرە بۆم شاگردی باشی زێوەرم
ئەو بوو هانی دام کە من هیچ کۆڵ نەدەم
هەر ئەوە ئوستاد و شێخ و ڕابەرم
گەر لە شیعرا هێز و ڕێزم دەس کەوێ
بێگومان هەر زێوەرە تاجی سەرم
گەر خودای شیعر و ئەدەب دڵگیر نەبێ
من ئەبێ سوژدە لە بۆ زێوەر بەرم
مەدحی بەرزی شیعری ئەو نابێ تەواو
گەر بنوسم چل کتێب و دەفتەرم

(*) ساڵی ١٩٤٨ نوسراوە

***

# سەرخۆش نییە

هەموو مەستێ سەرخۆش نییە
هەر نوستوویەك بێ هۆش نییە
هەیە مەستی دەستی غەمە
بۆ بادە قەت خامۆش نی یە
هەیەمەستی عەشقی یارە
کرداری پەست و بۆش نییە
هەرچی نالاندی بەدرۆ..
ساختەچی یەو نەخۆش نییە
هەرچی ژنێ کە رووی خۆشە
بەرێزەو خۆ فرۆش نییە
هەرچی قسەی خوارو خێچ بوو
قەشمەرە بادە نۆش نییە
ئەوەی بە فێڵبازی ژیا
بۆ چاکی بە پەرۆش نییە
وا مەزانن وەچاخ کوێرە
ژن کە رۆڵەی لە کۆش نییە
خراپی ژن ناپۆشرێ
سرپۆشی بە سەرپۆش نییە
جوانی ی مرۆڤ بە رەوشتە
تەنها چاو و برۆش نییە
قومار باز و گاڵتە چی یە..
ئەوەی عەشقی بە جۆش نییە
ئەو زێرەی کە دۆزرایەوە
هی من نییە هی تۆش نییە
***

## ڕادیۆکەم

وەستا ڕادیۆکەم بۆ چاکەرەوە
وایەر و بورغی وریا کەرەوە
ڕادیۆکەم مایەی شادی و خۆشیمە
یانەی دڵشادیم ئاوا کەرەوە
هەژارم پارەم زۆر لێ مەسێنە
بەلای خودادا باش لاکەرەوە
مەفەرموو ئەمە کاتی زۆر ئەوێ
دەس بە گیرفانی قوڵتا بکەرەوە
من دوو دیناری شینت ئەدەمێ
خێراکە ساخۆت ئازا کەرەوە
وتی بەسەرچاو وا بۆت چاك ئەکەم
بۆ دنیای شادی هەڕاکەرەوە

١٩٧٩/٦/١١

***

## پیاوی بێ حەیا

پیاوی بێ حەیا و ژنی حەیابەر
کە بۆ بەدکاری ئەبەستن کەمەر
پەلامار ئەدەن لە هەموو کەسێ
لە ناو کۆڵان و جادەو سەرگوزەر
لایان وەك یەکە ئاغا و میر و شێخ
دۆم و قەرەج و مەردی بێ هونەر
پلار و جنێو چەکی دەستیانە
کە ئەی هاوێژن بێ ترس و حەزەر
پێویستە کە ئەم جۆرە کەسانە
لە ناو کۆمەڵدا بکرێن دەربەدەر
چونکە ژیانی ئەم بەدخوانە
وەکو میکرۆبە پیس و پڕ خەتەر

١٩٧٩/٧/١

***

# دەربەدەری

ئەوەی ئەمڕۆ لە یانەی دەربەدەر بێ
ئەبێ هەر توشی داخ و دەردی سەر بێ
کەسێ لەم ژینە کاس و کەم حەواسە
کە گێژ و وێژ و پەست و بێ هونەر بێ
ئەبێ ئامادە بێ بۆ هەر حیسابێ
کەسێ ئەمڕۆ کەوا ڕێگەی لەبەر بێ
بەخۆشی نافڕێ بۆ سەر کەژی ژین
مەلێك ئێستا کەوا بێ باڵ و پەڕ بێ
وڵات پیرۆزە لامان خۆشەویستە
ئەوەی واتێ نەگا خۆ ڕەنگە کەڕ بێ
کە دەستی دایە ناپاکی مناڵت
فڕێیدە لایبە گەر بەندی جگەر بێ

١٩٨٠/٢/٢

***

# شیننامه بۆ خوالیخۆشبو (کاکەی فەلاح)

یەزدانی ئەدەب مات و دڵ تەنگە
فریشتەی شیعر پەست و بێ دەنگە
ئاسمانی هەستی بەرز و زانستی
لێڵ و تاریکە چی یەمەبەستی
خەریکە داکا ڕەهێڵەی خەفەت
تێك بدا کۆشکی هەست و محبەت
ئەمە بۆ چی یە ساچی ڕوویداوە
چ مەردێکی چاك ئاخۆنەماوە
وەڵامی دامیٚ دڵی برینـدار
وتی نازانی چەرخی ڕۆژگار
کاکەی فەلاحی کۆچ پیٚ کردووە
یانەی ئەدەبی گشت ڕوخاندووە
نوکتەی شیرین و شیعر و بیری جوان
لەگەڵ کاکەدا چوونە گۆڕستان
هەرچەندە زۆرە ساڵانی ژینم
وێنەی ئەم زاتە کەسیٚ نابینم
هەستیاریٚ بوو بە نرخ و باڵا
شایانی ڕێز بوو لە هەموو حاڵا
کردار و پیشەو ڕەوشتی چاك بوو
لەگەڵ ناحەزیش زوبانی پاك بوو

یاریدەدەر بوو بۆ لێ قەوماوان
لە گشت ژیانیا دوور بوو لە تاوان
بۆ هەموو کەسێ سایەی ئومێد بوو
داخەکەم وا زوو لە دنیا دەرچوو
جێگەی ون نییە سوپاس بۆ یەزدان
چاك و بەنرخن وەك خۆی کوڕەکان
ئەوانیش هەموو خاوەن شعورن
لە کار و پیشەی خراپە دوورن
جێگەی ئەو باوکە باشە ون ناکەن
خەریکی پیشە و کردەوەی چاکن
ناوت زیندووە هەتا قیامەت
سا لە گۆڕت بێ سەد هەزار ڕەحمەت
***

## دنیای ناخۆشی

دنیا کە سەراپا خەفەت و دەردی سەرێکە
هاوڕازی نەفام و پەتەڕی و بێ هونەرێکە
ئەو مەردە نەبەردەی کە یەکەم ڕابەری دین بوو
ئێستا کە پەژارەی وەتەنە و دەربەدەرێکە
هەر ئەسپێ بە نەرخ و ڕەسەنە ئێستاکە ڕووتە
کام زین کە گرانە وا لەسەر پشتی کەرێکە
زانایە هونەرمەندە کە بێ ناو و نیشانە
بێ بەهرە لە زانستی یە وا بەهرەوەرێکە
ئەو شاعیرە سووتابوو کە بۆ خاك و ولاتی
وا ناوی لە ناوا نی یە ئەو بێ خەبەرێکە
ئەو ڕابەری ئینسانی یە زۆر بەرزو بەڕێز بوو
ئیستاکە خۆراکی هەموو خوێنی جگەرێکە
ئەو بازە کە سەد بازی فەزا بوو لە فڕینا
ئەمڕۆ لە زەوی کەوتووە بێ باڵ و پەڕێکە

١٩٨٠/٤/٢٠

***

# هاوەدەمی زانا

ئەو کەسەی زانایە دیارە هاوەدەمی زانا ئەبێ
خۆی ئەپارێزێ لە بەدخوو زیرەك و وریا ئەبێ
کاری وا ناکا بڕەنجێ کەس لە دەستی یا دەمی
بۆ ژیان کوێرانە ناچێ چاپوك و بینا ئەبێ
گەر ڕەوشتی پاکە هەرکەس گیانی خاوێنە لە ترس
چونکە مەردە ئەو لە ژینا هاوەدەمی ئازا ئەبێ
تێکی نادا تاکو ماوە دەرد و ئاشوبی زەمان
قەت لە خشتە نابرێ هەروا ئەژی هەروا ئەبێ
گەر کەسێ ون کا لەبەر بەدکاری ڕێبازی ژیان
کۆسپی شوومی دێتە ڕێ زوو ڕوو ڕەش و ڕیسوا ئەبێ
بەزمی باغی شادی بۆ هەر بێ فەڕێ دەس ناکەوێ
هاوسەری ئەو جۆرە بەزمە مەردی زۆر دانا ئەبێ

١٩٨٠/١٠/٤

***

## گلەیی لە بەهار

ئەمڕۆ کە شەشی مانگی ئایارە
بەناو ڕۆژێکی خۆشی بەهارە
بەڵام تا بڵێ ی گەلێ سەرمایە
هیچ کەس بەهاری بە بیرا نایە
هەورە تریشقە و ڕەهێڵە و ناڵە
وەهای لێ کردووم ژینم لێ تاڵە
لە ناو ژوورێکی ساردا خزاوم
لە داخا فرمێسك ئەڕژێ لە چاوم
ئەگەر نەگبەتی ئەم شارە نەبێ
بەهاری ئێمە چلۆن وا ئەبێ
نە گوڵ دیارە نە یاری ڕوو گوڵ
نە شتێك هەیە شادی بێ بۆ دڵ
من قەت بەم ڕۆژە پێ ی ناڵێم بەهار
ناڵێم ئومێدی خۆشی ڕۆژگار
ئەی خوای گەورە گەر بەهار وابێ
ماڵی پاییز و زستان ئاوا بێ
ئیتر ئەوەنە پەست و غەمگینم
لەلام وەك شەوی تاریکە ژینم

١٩٩٢/٥/٦

***

## ڕەوشتی خراپی نالەبارێك

داریٚکی چاکەی قەت نەرواندووە
کەچی ئەی بینی هەردەم ماندووە
سەروچاویشی هەر ترش و تاڵە
ئەڵیٚ ی معاشیان لیٚ فڕاندووە
دە پاکەت سیگار ئەدا بە دوکەڵ
چل پیاڵە چاشی هەڵقوڕاندووە
هەندیٚ جار ماتە بیٚ دەنگ و وتار
هەندیٚ جاری تر زۆر نەزان دووە
لەگەڵ جنێودا زۆر ئاشنایە
بەرگی چاك بێژی زوو دڕاندووە
دڕك ئەچێنیٚ لە ڕیٚ ی خەڵکیا
سەری لە ئایین کەم لەقاندووە
ناحەز بە گەل و خەمی خۆیەتی
لە بۆ بێگانە خۆی تراندووە
پارە قەرز ئەکا کە نایداتەوە
بەرهەمی راستی هەڵوەراندووە
خزمایەتی لای سووك و بیٚ نەرخە
شوشەی دڵپاکی تێك شکاندووە
مرۆڤی وەها مانی زیانە
گەرچی زیندوشە خۆی مراندووە
کۆشکی زۆر بەرزی کرداری چاکەی
بە پاچی بەدی هەڵوەشاندووە

***

# شیننامه بۆ لیلۆسی جوانه مەرگ (*)

کچە جوانەکەی زۆر خۆشەویستم
تەنها ژیانی تۆ بوو مەبەستم
لە دنیا مایەی شادمانیم بووی
بەرهەمی باخی کامەرانیم بووی
چاکتر و پاکتر کوڕەزای من بووی
لە ناو دەروون و دڵما ساکین بووی
ئەمویست وەکو گوڵ بگەشێتەوە
نەك وا بە جوانی سەر بنێتەوە
ئەمویست کە ڕۆڵەت بگرمە باوەش
نەبم لە خەندەی لێوەکەت بێ بەش
ئەمویست وتارو هەستت شیرین بێ
گیانت ئارەزووی لە خۆشی ژین بێ
نەم ئەویست کەوا بە نامرادی
کە بەجێ بێڵی دنیای ئازادی
نەم ئەویست کەوا زۆر بە کەساسی
دەمت لێك بنێی کەسمان نەناسی
نەم ئەویست بەرگی دوایت کفن بێ
شێوەی شیرینت لە ئێمە ون بێ

ئەم ئەویست کەوا دایك و کەس و کار
بۆت بگرین بە کوڵ وەك هەوری بەهار
لیلۆس ئەی لیلۆس شۆخی جوانە مەرگ
وا لەت و پەت بوو لامان دڵ و جەرگ
شێوەی دڵسۆزت ناچێ لەبیرم
وەك تۆ خوێن پاك و زرنگ و ژیرم
ئیتر بێ کەڵکە لەلای من ژیان
خۆزگە من ئەبووم بۆ تۆ بەقوربان
قەت سارێژ نابێ جەرگی بڕاوم
هەر بۆ تۆ ئەگریم هەتاکو ماوم
دێمە سەرگۆڕت هەر کات و ساتێ
تا فریشتەی مەرگ بەڵکو ئەمگاتێ

---

(*) ئەم شیننامەیەی بۆ کوڕەزای جوانە مەرگ (لیلۆس فرهاد) لە ساڵی ١٩٩٠ دا وتووە.

***

# بەبێ غەم ژیا

ئەوەی لەم چەرخە بەبێ غەم ژیا
بەهرەی دی لە ژین گەرچی کەم ژیا
ئەو مەردە گیانی ئاوێتەی دەردە
کە بۆ دینـار و بۆ درهـەم ژیا
تروسکەی چرای ژیـانـی کزە
کەسێ تا ماوە بـە ماتـەم ژیا
بێ شك مردووە گەرچی زیـندووبێ
ئەوەی بێ بەهرەو بێ بەرهـەم ژیا
پەست و بێ نەرخ و سووکە مرۆڤێك
وەك جانـەوەری چیاو چـەم ژیا
بڕوا ناکرێ بە چاکی کەسـێك
لەو دوور کەوتەوە لەگەڵ ئەم ژیا

١٩٨١/١/١

***

# منالی خراپ

منالــــی خـراپ لــە خێزانێکـا
وەك ئاگر وایـە لـە خەرمـانێکا
چۆن ئاگر خەرمان پاك ئەسوتێـــنـێ
منالّ لە خێزان ســەر ئەشێوێنێ
مـنالی خراپ کەوا جنێـــو فرۆشـە
مۆخ و ئیســقانی پیس و نەخۆشە
منالّ بە چـاکی پەروەردە نەکــرێ
رێگەی ناپاك و بەدخوان ئەگرێ
گەر باوك و دایکی چاویان لێ پۆشــی
ئەژی بەپیسی و پەستی و بێهۆشی
مـنالـــێ کە دیت بلّـح و بەدکارە
باوکی لەم کارە زۆر تاوانــبـارە
مـنـالی خـراپ مـەرگـی بـاشـتـرە
مـردن لە ژینی پیس هـیواشـتـرە

١٩٨٤/٦/١٩

***

## لاویی بگەڕێتەوە

تۆ بڵێ ی لاویی بگـــەڕێتەوە
پیریی بە ژێری ســـەربنێتەوە
زســـتانی ژیان ناوی نەمێنێ
ســـاڵی دوو جارێك بەهار بێتەوە
گەڵای باخی ژین هەر سەوز و تەڕبێ
خونچەی دڵشادی بگەشــێتەوە
تۆ بڵێ ی هەوری خەفەت تێ پەڕێ
ناڵە و بروســـکەی نەمێنێتەوە..
مرۆڤ هـەر بژین زۆر بە ئازادی
کە بە سەربەستی بسووڕێـتـەوە
لێوی زۆر جوانـی پـڕ زەردەخەنە
ئەو ڕەنگە ئاڵەی قەت نـەچێتەوە
تاریکی شـــەوی نەگبەتـی بـڕوا
رووناکی ئومێـد نەکوژێـتـەوە..
هەموو کەس نەی بێ غەمی نەبوونی
بۆ پارچـە نانێ نـەپاڕێـتـەوە
ئاوازی شـوومـی بوومی دڵشكێن
لە باخی ژینـا نـەیسـڕێـتـەوە
ئەترسم ئەمەی نووسیم خەیاڵ بێ
یا وڕێـنەمە و ئەجوڵـێـتـەوە

***

# ئەرکی ژیان

هەرکەس خەریکی کاری خۆیەتی
بۆ ئەرکی ژیان هات و چۆیەتی
ئەوەی ڕۆح پاك و مرۆڤ و ژیرە
بەرزی ئامانجی ژیان هۆیەتی
ئەوەی کە ئەمڕۆ بەدکاری ئەکا
سبەی ئەبینێ باوکە ڕۆیەتی
ئەوەی ژیانی گیرۆدەی ژانە
کەم هێزی هەردەم لە ئەژنۆیەتی
ئەو دەس قوچاوەی پارە جەم ئەکا
هەمیشە ورتەی هەشت و نۆیەتی
ئەوەی کە مەردە و کرداری چاکە
شادی و ڕووناکی لە ئاسۆیەتی
١٩٨٤/٨/٨
***

# كە پارەت بوو..

كە پارەت بوو هەموو كەس هەر براتە
ئەوەی نایناسی دۆست و ئاشناتە
ئەڵێن پاشا، ئەڵێن ئاغا، ئەڵێن بەگ
ئەگەرچی باوكی تۆ بێ نەرخ و لاتە
ئەوەش چارەی گران و نالەبارە
بە وێنەی كۆیلە هەردەم وا لە لاتە
بەرەو پیری ئەتۆ دێن كار بەدەستان
هەموویان چاوەڕوانی مەرحەباتە
ئەگەر پارەت نەبوو چارەت گرانە
ئەڵێن كابرایەكی بێ دەسەڵاتە
هەموو خزمان لە تۆ دوورە پەرێزن
لە لایەنیان جنێوت پێ خەڵاتە

١٩٨٤/٨/١٥

***

# بـرایـی

بـرایـیمـان بـرایـی بـوو
بەڵام کیسـە جودایی بوو
بـرا پـارەی هـەبوو نەختێ
کەوا بەم نەختـە بایی بوو
منـیش خۆراکی سێ وەختەم
بە تەنیا نـان و چایی بوو
لـە مـن دوور کەوتـەوە خـێرا
ئەمەش کاری خودایی بوو
وەلێ بۆ من هەلێ هەڵکەوت
بـەمـە کارم کـە ڕایی بوو
لـە دوو گـۆڕانـی ئـەم حاڵـە
ژیـانـم بـەزم و شـایی بوو

١٩٨٤/٨/٢٩

***

## وەرگێڕانی بەیتێکی سەعدی شیرازی بۆ کوردی

پیشەی چاکان ناگرێ ئەوەی کە بەد ڕەگەزە
تەربیەتی ناکەسان وەك گوێزی سەر گومەزە
هەندێك ڕەوشتی مرۆڤ
پیاوی زۆر بڵێ و ژنی گرینۆك
هیچ و بێ کەڵکن وەك گەڵای پیشۆك
مەلای هیچ نەزان کوێخای چەنەباز
ژیانی گەلن وەك میوەی قرپۆك
دراوسێ ی دڵسۆز گەلێ باشترە
لە خزمی خراپ لە برای ناکۆك
ئەوەی کە فێری کردەوەی سواڵە
ئاوی ڕووی ئەتکێ ڕۆژی صەد تنۆك
ئومێدی چاکی قەت لێ ناکرێ
مرۆڤی خوێری و نەفام و گەڕۆك
گەر ئاگاداری ڕەوشتی نەبن
خۆی ئەدۆڕێنێ ژنی چاو چنۆك
ئەوەی هەر ڕۆژەی ڕەنگێکی هەیە
خۆی بێ نەرخ ئەکا وەك دەزووی قرچۆك
ئەو یارەی کەوا نەرخم ئەزانی
بە فیدای ڕووی بێ بەڵخە و حەمامۆك

١٩٨٤/١٢/١٢

***

## له ژینا غەمێك

هەرچی کە نەی بوو لە ژینا غەمێك
ئەژی بەخۆشی لە چیا و چەمێك
لە ژینا هیچ کەس بەبێ غەم نییە
کە زۆری نەبێت هەیەتی کەمێك

***

## سوپاسم مەکە

کە یاریدەم دای سوپاسم مەکە
لە لای ئەم و ئەو تۆ باسم مەکە
رێگەی خۆت بگرە و خێرا تێپەڕە
بە هاشە و هوشە هەراسم مەکە

***

ئاوارە بووی

لە دنیای ژینا کەبێ کارە بووی
لە دەس هەژاریی وا ئاوارە بووی
هەلت کە دەستکەوت زۆر پەلەت نەبێ
پارت لەبیر بێ کە بێ پارە بووی

***

## خۆت بسووتێنی

وەك پـەروانـه خـۆت بسووتـێنی
یـا وەکو هەڵو هـەڵمەت بـهێـنـی
ئەوسا پێت ئەڵێن پیاوێکی مەردە
لـه ناو کـۆمـەڵا بـرەو ئـەسێـنـی
***

## ئەڵێم سەرمایە

کـاتێ زستان هات ئەڵێم سەرمایە
وەختێ هاوین هات ئەڵێم گەرمایە
سەرما و گەرمـاشی هەردوو مژیـوە
ئـەو قاتە جلـەی وا لـە بەرمایە
***

## وا لـە مێشکما

ئەو بیرو هۆشەی وا لە مێشکما
لە کـاری چاکە ئەکوڵـێتـەوە
ئەو ئاخ و داخەی کەوا لە دڵما
بە خوێنی لەشما ئەسووڕێتـەوە
***

## مەچۆ تەنیشتی

خزمێ کەوا دێت خوارە ڕەوشتی
خۆتی لێ دوورخە مەچۆ تەنیشتی
بەند و سەر زەنشت لە لای گاڵتەیە
سوێند و پەیمانیش لای پووچە گشتی
***

## هاوبەشیی نەکەی

لەگەڵ بەدکارا هاوبەشیی نەکەی
یا خۆت دووچاری ڕوو ڕەشی نەکەی
ئەو دڕکەی قاچت وا زامار ئەکا
ئاوی مەکە ژێر با گەشی نەکەی
***

## نەما هاوسەرم

سەرم لێ شێوا نەما هاوسەرم
نازانم پەنا بۆ لای کێ بەرم
کوڕ و کچ گووتیان بێرە لای ئێمە
بەڵام بۆ هیچیان نییە باوەڕم
***

## جوانی لە خوودا

بۆ ژن چاکترە جوانی لە خوودا
هەروەك پێویستە جوانی لە ڕوودا
ئەگەر جوانی بوو لە خوو و لە ڕوودا
نەرخی باڵایە لە ئارەزوودا
***

## کەوتۆتە دەستی

یارم دڵی من کەوتۆتە دەستی
لەم دەسکەوتە ئەو چییە مەبەستی
دڵ بۆ ئەو نەبێ سا بۆچی باشە
لە دڵداریا ئەو بەرزە هەستی
***

## لادە لە من

لادە لە من براکەم
کزی مەکە چراکەم
لە بەر بەدی ڕەوشتت
وا خەریکم هەڕاکەم
***

(کۆمەڵایەتی)

## هەست و مەبەست

ئەم جۆرە شیعرە کەوا ئەیخوێنی
ناوم لیٚ ناوە بە هەست و مەبەست
لە لێکدانەوە گەر دانەمێنی
مەبەست ئەبینی لە چۆنیەتی هەست

*	*	*

ڕێوی کە هات و کلکی ڕاوەشان
نیشانی ئەدا کە زۆر ئازایە
ماریش لەسەر خاك کە دیت خۆی خشان
دیارە کە ژاری لە ناو دەمایە

*	*	*

مەیمون لاسایی خەڵك ئەکاتەوە
کەوا خۆراکی باشی پیٚ بدەن
کەری بەسەزمان تاس ئەیباتەوە
لە ترسی ئەوەی باری لیٚ نەکەن

*	*	*

بولبول لە ناو باخ بە سۆز ئەخوێنێ
دڵداری ی گوڵی وا لە دڵدایە
پەروانەش کەوا خۆی ئەسووتێنێ
گیان فیداکاری شەوقی چرایە

*　　　*　　　*

ئەوەی کە وا تۆ ئەکا سەرزەنشت
خۆیشی ئەو کارەی هەر پێکراوە
ئەوەش خەنجەری گرتۆتە ناو مشت
نووکە خەنجەری هەر لێدراوە

*　　　*　　　*

دز کە لە ماڵان دێ دزی ئەکا
یاخو برسییە یا ڕەش و ڕووتە
ئەو بازرگانەی فێڵبازی ئەکا
یا لێقەوماوە وە یا نابووتە

*　　　*　　　*

ئەوەی لە کەسان ئەکا هەڕەشە
هەموو سەرمایەی خۆ هەڵکێشانە
لە ژینا تەختەی بەختەکەی ڕەشە
دڵی پڕ غەمە و سەری پڕ ژانە

*　　　*　　　*

ڕاوچی بێ هونەر کە ئەچێ بۆ ڕاو
گەلێك بە زیرەك خۆی نیشان ئەدا
گەر ئاسکی دی لە کەناری ئاو
تازە چەقۆکەی لە هەسان ئەدا

*　　*　　*

ئەو دەوڵەمەندەی دەستتی قووچاوە
چاوی زۆر کزە لە ئاستی چاکە
لە دنیای ڕێزدا بەشی نەماوە
هەرچی پێ بڵێن ئەڵێ: قەیناکە

*　　*　　*

ئەو پزیشکانەی کە تەماعکارن
قەت گوێ نادەنە چاکبوونی نەخۆش
دیارە لای خەڵکی هەر نادیارن
لە مرۆڤایەتی ئەژین لەسەر بۆش

*　　*　　*

کەسێك بۆ تالان هاتووچۆیەتی
ناوی بە پیسی ئەکەوێتە ناو
مەزبەلەی مێژوو جێگای خۆیەتی
تەماشای ئەکرێ وەك سەگی گلاو

*　　*　　*

هەر زەلامەت دی مەلّیٚ دلیٚرە
(( لە هەمووو هەوریٚ باران نابارێ ))
زۆر چاوساغ هەیە لە عەقلّ کویٚرە
کەوا پەی نابا بە هیچ کرداریٚ

*　　　*　　　*

ئەوەی بۆ پارە جەرگی پارەیە
گەر هەولّ بدا ئەگاتە ئاوات
بەلاّم تەمەلە یا بیٚکارەیە
ئەژی بە پەستی بۆ سوالّ و خەلاّت

*　　　*　　　*

ئەو جاشە کەرەی کەوا ئەزەڕێ
لە هەریٚز و گیا تیٚری خواردووە
ئەو توولە سەگەش کەوا ئەوەڕێ
زۆری برسیٚتی وای لیٚکردووە

*　　　*　　　*

١٩٨٠/٥/٩

***

## ژیانی ئەمڕۆ

پاییزی ژینم وەختە ئاوا بێ
وا زستانیش دێ بە ملی شکاو بێ
من لە بەهارا هیچ خۆشیم نەدی
سا ئەبێ ئیتر چیم لەبەر چاو بێ
کەس و کاریشم وا لێم بێزارن
پێم ئەڵێن یاخوا جەرگی بە ئاو بێ
وا چاوەڕوانی مەرگ و نەمانم
ئەگەر هات یاخوا باشە و لە ناو بێ
ئەم خەڵکە هەموو نۆکەری مادەن
ڕەنگە ئێستاکە هەر ئەمە باو بێ
گەر پارەت پێ دان ئەڵێن ئافەرین
کەس نی یە بەخوا وەکو تۆ پیاو بێ
گەر نەشت دانێ دەڵێن چرووکە
وا چاکە بمرێ عەمری نەماو بێ
ئەمەیە حاڵی ئەم مرۆڤانە
وا نەبێ ڕەنگە لە ژین تۆراو بێ
***

## هاتووچۆ مەکە

بە کۆسپیا هاتووچۆ مەکە
لەگەڵ کەسا درۆ مەکە
گەر ئەتەوێ ڕێزت هەبێ
بە فیشاڵ باسی خۆ مەکە
ئەوەی ئەزانی بەدخووە
لەگەڵیا گفتوگۆ مەکە
لە ژنا زۆر جوانی هەیە
مەدحی چاو و برۆ مەکە
با لە ژینا سووك بێ سەرت
هاوڕێ لە بۆ خۆت کۆ مەکە
ئەوەی ژییاوە بێ حیساب
حیسابی کۆنی بۆ مەکە
کەسی خراپی تۆ کە مرد
بۆی مەگری باوکەڕۆ مەکە
بەقسەی نەرمی دوژمنت
برای خۆت دەسخەڕۆ مەکە
برات گەر کردی خراپە
ئەو ئەگەر کردی تۆ مەکە
کە لاواز بی وەك چۆلەکە
هاودەمێتی هەڵۆ مەکە
کەسێ کە جێ ی بڕوا نییە
چیت لە دڵە بۆی ڕۆ مەکە

١٩٨٤/٣/١٣

***

## دۆستایەتی

دۆستایەتی هەر قسە و وتار بێ
قەت بڕوا مەکە بۆ کەس بەکار بێ
قسەی بێ پێزو کرداری بێ هێز
بۆ ئەوە باشە هەر نادیار بێ
کەسێ ناکەس بێ جێ ی بڕوا نییە
گەرچی ڕوو بە ڕوو گوڵی بەهار بێ
بە منەت نامەرد نانت پێ بدا
یاخوا ئەو نانە بە زەهری مار بێ
ژیانی بە ژان پووچ و بێ نرخە
مرۆڤ گەر شاد بێ و سەرمایەدار بێ
بێ ئیشوکاریی پیاو ڕیسوا ئەکا
ناخۆشی ژیان تووشی هەرکەس بوو
ئەبێ تێکۆشێ هەتا رزگار بێ
دوورە لە شەرەف پیاوی خۆ فرۆش
با سەرمایەشی هەزار هەزار بێ

***

# دوشمنی عاقڵ و دۆستی بێ عەقڵ

## حیکایەتێکی خۆش

پیاوێك بوو ساحێبی باغەوار و قەسرێکی جوان
پڕ لە لالە و سەروو و گوڵناز و بنەفشە و ئەرغەوان
هەرچی میوەیێی دڵ تەسەووركا هەبوو لەم باغەدا
فیه ماتپتهی الانفس عینی لوکزاری جینان
تابڵێی پیاوێکی ئەحمەق و سەفیهو بێخێر
بێ دیرایەت، بێ فرایە و فروماية و نەزان
هیچ رەفیقێکی نەبوو ورچێ نەبێ بۆ هاودەمی
میوەیی زۆری ئەدایە گۆشت و چێشت و ئاو و نان
رۆژ و شەوکابرا لەگەڵ ئەم بێ جیابوونەوە
رای دەبوارد عەینەن وەکو دۆستی رێك و میهرەبان
مارێکیش بوو دوشمنی ئەم پیاوە غایەت پڕ فیکر
وەختی نوستن گەلی شەو قەسری ئەکرد بۆ پێوەدان
ئەچووە نیزیکی و ئەیگوت چاکە من پێوەی نەدەم
نەك کە من جولامەوە کابرا وەکو شێری ژیان
راپەری بۆم دەست بداتە دار و کچك و گڵ متك
قەبزی ئەرواحم بکەن کابرا و ورچی دارەوان
چاك وەهایە رابوەستم بەڵکو خافڵ بێ لەخۆی
ئینجا ئەوسا بیکوژم راکەم بەبێ خۆف و زیان

رۆژێ کابرا نوستبوو ورچیش ئەمینداری ئەکرد
مێش لە کابرا نیشتبوو ورچیش لەبۆ دەفعی ئەوان
بەردێکی هێنا کە باتمانێ سەری شاین ئەبوو
نایە سەر تەوقی سەری بۆ دەفع و مەحوی مێشەکان
دای بەسەری تەپڵی سەریدا مێش بەجارێ هەڵفڕی
کەللەی پانکردەوە مێشکی بە یەکدەفعە پژان
دوشمنی عاقڵ کە مار بووهیچ زیانێکی نەبوو
دۆستی کەر کوشتی لەباتی چاکە و مەردی باغەوان
دوشمنی عاقڵ لە دۆستی کەر گەلێ لام چاترە
ئەم بە جەهل ئیشە ئەکا ئەو بە فیکر و ئینتیحان
قەت لەگەڵ بێ عەقڵ جاهیل ئەی (عەلی) هاوڕێ مەبە
با دووسەد دەفعە بەقوربانت بکا رۆح و گیان

...

لە شاگردانی مەکتەبی ئیبتیدائی ی سلێمانی –عەلی عارف–
هەفتەنامەی ژیان ساڵی (١) ژمارە (٣٩) ٢٨\١٠\١٩٢٦
ئەمە یەکەم شیعری بڵاوکراوەی عەلی عارف ئاغایە کە ئەودەم خوێندکار بووە...
***

## هاوار بۆ برادەران

ئەی برا چیتە لە باتی شیعری عەشق و زوڵفی یار
خۆت فیدای خاکی وەتەن کە، بۆ وەتەن بەجان نیسار
شیعری عەشق و خەت و خاڵ هیچ فایدەی تێدا نیە
شیعری میللیەت بڵێ بۆ قەومەکەت تۆ جار بەجار
سا بە ئازانە بکە جوهدێ لەبۆ هاو قەومەکەت
بەڵکو تۆ بۆ قەومی کورد ببتە نموونەی ئیفتیجار
ئێستە کە هەرمیللەتی تۆ ناوی دێنێ گشتییان
ساحێبی عیلم و سەنائیع تێگەیشتوو، خوێندەوار
تۆش وەکو شێری ژیان خۆت بهاورە مەیدانی عیلم
قەت لە سەغڵەت لامەبە ئەی غونچەی فەسڵی بەهار
تاکو رۆحت تیا هەیە سەرفی بکە بۆ میللەتت
حەیفە بێ خزمەت بمێنێ باغ و مێرگ و مێرغوزار
چونکە ئەمرۆ میللەتی بێکەس هەموو تۆ شك دەبەن
تۆش لەسەر ئەم قەومە لابە چاوەکەم تۆزو غوبار

***

هەفتەنامەی (ژیان) ساڵی (١) ژمارە (٥) ١٩٢٧

تێبینی: شاعیری کورد پەروەر، ئەحمەد موختار جاف لەم رووەوە دەست پێشخەری کردووە، عەلی عارف ئاغایش پەیرەوی هەمان بۆچوونی ئەوی کردوە.

***

## نوبزەیەکی ئەدەبی

ئەو کەسەی فیعلەن بە بەرزی نەفسی خۆی ئیزهار ئەکا
حورمەت  و شوهرەت بۆخۆی هەمراز و دۆست و یار ئەکا
هەرکەسێ ویجدانی پاك و عیززەتی نەفسی هەبێ
بۆ ژیانی مەحوی شێوەیی زیلل و ئیدبار ئەکا
کەسبی جوانی شوهرەتت بۆ ناکرێ تا سیرەتت
دائیما بۆ لەهوی بێهوودەی زەمان هاوار ئەکا
ئیستیفادەت بوو کە بۆ ئەبنایی جینس و میللەت
ئەسپی بەختت حورییەت کارانە بۆ خۆی غار ئەکا
گەرچی سوڵتانی زەمین بی بۆ بەشەر چاکەت نەبێ
هەرکەسە بۆ خزمەتت هەردەم دەمی ئیحزار ئەکا
چاو لە کەس مەبڕە و بەبێ ئیشی سەرفی مەکە زمان
چونکە زیللەت وەختی بێکاریت بەتۆ خۆی بار ئەکا
ئەو کەسەی نەفعی نەبێ هەوڵی خەسارەی خەیرئەدا
ئاخۆ فەرقی خۆی چلۆن توخوا لە گورگی هار ئەکا
هەمدەمی شەخصێ مەبە عالەم کەخۆی لێ لابدا
دۆستی زاتی بە لەڕێگەی چاکە دایم کارئەکا
قەت لە ئیشی چاکەدا مەئیوس مەبە بۆ عاقیبەت
چونکە ئەقدامت نەتیجەت دائیما بۆ دیار ئەکا
قەت مەڵێ بەدبەختم و تاڵع لەگەڵما دوشمنە

هەوڵ و عەزمت، مەقسەدت وەك مانگی نەوئیزهار ئەكا
تەفرە خۆری قەولی هەر شەخسێ بەبێ تەجروبە
تا بەبورهانی حەقیقەت فیكری خۆی ئیقرار ئەكا
بۆ قسەی شیرینی هەركەس دائیما غەرامەبە
چونكە زۆر شیرین لەتیندا لە زەهری مار ئەكا
خود پەسەندی مەگرە بەرو بۆ ئمووریێكی ژیان
............ بەشەر یەكسەر لەخۆی بێزار ئەكا
وەقتی حیدەت بە گوفتاری هەزەل مائیل مەبە
گەرچی........ بە ئیجراكردنی ئیسرار ئەكا
بۆ غەریمەت كردنی حەق چ كەس فیكرت نەبێ
پیاوی خائین خەڵقی سەیری بەسوك و خوار ئەكا
حاصلی هەرچاكە چاكە قەت تەریكی لێ مەدە
تاكو رۆحت عەزمی كۆچی دەهری ناهەموار ئەكا

...

هەفتەنامەی ژیان ساڵی (٦) ژمارە (٢٩١) ١٧ئابی١٩٣١

***

## گفتوگۆ لەگەڵ شاخی سوورکێو

سلێمانی ١٩٢٨/٦/١

کەژی سوورکێو لەبەر چی لووتی بەرز کردەوە لێمان
سەرت رووت کردووە وەختە بگەیتە مەرتەبەی کەیوان
دڕندەی سەر زەمینت بۆچ حەشارداوە لەناو خۆتا
لەخۆت گرد کردووە هەرچی کەبووەتە دوژمنی ئینسان
بەهارانیش هەرەس دێنیٚ بەسەر رێبواری کوردانا
بە زستانانیش بەسەرماکەت ئەخەیتە کاروان گریان
لەبەرچی بوویتە کانگای جەردە و دز (دائم الاوقات)
حەیاتی قەومی کوردت خستووەتە تەهلوکە و گیاندان
ئەوەندە مەغروور مەبە، دەعیە و تەکەببور هێندە مەنوێنە
لەشاخی (ئەلپ) و (رۆشۆز) فەزڵی تۆ زیاتر نیە قوربان
زەمانیٚ دیٚ لەشت کون کون ئەکەن بۆ رێی شەمەندۆفەر
ئەبیتە رێگەی مۆتۆڕ و رێبازی هەموو کوردان
قەدت قەبڕ ئەکەن بۆ ئەبنییەی زۆر خۆشی وەك ئۆتێل
سەرت چاك تەخت ئەکەن بۆ جێگەیی گوڵزار و باغستان
دڕندە و وەحشیانت پێستی ئەگروون بۆ لەبەر کردن
دز و جەردەت هەموویان ئەبنە چایچی و خانچییی کاروان

بەڵام ئەوسا ئەبیتە مەنبەعی کەیف و سرووری خەڵق
ئەبیتە جەننەتێکی بێ میسالی ئەهلی کوردستان
لەچوار ئەترافەوە عالەم بە دەستە دێنە سەیرانت
ئەچیتە ریزی شاخی ئەوروپا و کێوەکەی لوبنان
ئەوا من پێم وتی: تۆ قەت لە یادت دەرنەچێ سورکێو
لە فەصلی ئاتیتا ئەم موشکیلانە حەل ئەبێ ئاسان

...

بەختیار زێوەر

***

## جوابی سورکێو (١)

**وەکیلی راستی سورکێو: عەلی عارف ئاغا**

**نیشانەی شەئنی کوردە رەفعەت و بەرزیم بەسەد عینوان**
**کە سەربەرزی ئەکەم حەتتا لەگەڵ ئەیوانەکەی کەیوان**
**سروشکی عەشق و مەیلی میللەتە سەیلی بەهارانم**
**ئەڕێژم دەم بە دەم عالەم ئەبێتە زەلزەلە و تۆفان**
**دڕندەی جەهلە بیللا جەرگی کوردی کردووە لەت لەت**
**ئەنیسی قەلبی من بۆ حاڵی ئێوە جۆششە و گریان**
**بەلەعلی تیٚ ئەگەن وەقتی سەفەر بەرق و بریقەی بەفر**
**بەیادی سیرعەتی فەوجی فەلەك نازل ئەبن بۆیان**
**لەسەر (رۆشۆن) و (ئەلپ) و (پیرنە) فازلترم تەحقیق**
**بە تەرفیعی قەدیمی جەدی ئێوە بووم بە شاهیدان**
**کە قەومی کورد گەیشتە وەزع و جاە و رەفعەتێکی تام**
**لەت و کون کەن لەشم، حەللی بکەن ئامال و موشکیلتان**
**مەقامی غیرەتە بۆمن کەبشکێنن هەموو ئەعزام**
**موزەییەن کەن هەموو جەستەم بە ئۆتێل و بەباغستان**
**لەپێناوی تەرەقیقدا بخنکێنن بەسەد نیللەت**
**دز و جەردە و وەحشیانم دوون و ئەعلایان**

خوا سا تاجی ئەم جاهەم لەسەر نێی تا لە عالەمدا
بەسەتوەت بەڵکە بچمە ریزی شاخی پیرەنە و لوبنان
هەتا عالەم بەسەد حیرەت کە عوشرەتگاهی من بینن
لەهەر لاوە بکەم ئیحرازی تەجهیزات لەبۆ سەیران
لەحاڵی حازرا جەهدیێ بکەن جەردەی جەهل دەرکەن
هەتا بۆ ئەسڵی ئاتی حەل بکەن ئامالێ و موشکیلتان

...

(١) رۆژنامەی ژیان ژمارە (١١٧)ی ١٤ی حوزەیرانی ١٩٢٨

***

# چوومە لای

چوومە لای نیگار دیم کە نوستبوو
لەسەر چەرپایەك جیٚ ی ڕاخستبوو
کوڵمی وەك چرا وا درەخشان بوو
بە قردێلەی سوور پرچی بەستبوو
تەشی دانابوو زۆر نزیك لە خۆی
باقڵ بۆ بلوز ڕیسی ڕستبوو
زوو لە خەو هەستا چاو خەواڵوبوو
دەنگی پیٚ ی منی هەڵبەت بیستبوو
ناحەزی ناپاك کەوا توشم بوو
وەك سەگ بەتانە دڵی گەستبوو
داواکاری یار جیٚ بەجیٚ کرا
بۆم ئامادە کرد هەرچی ویستبوو

١٩٨٣/٢/٢٠

***

# دڵنیابە..!

دڵم بۆ تۆیە تۆ دڵنیابە!
ئەگەر درۆم کرد لە من جیابە
گیانە بڕوات بێ بە دڵپاکی من
وەك من بە وەفا تۆش بەوەفابە
قەت فریو مەخۆ بە واتای نەرم
ئەگەر چی ژیری بەڵام وورپابە
هەڵت ئەبژێرن بە خوای جوانی
هەر تۆ تاقانەی زۆر بە هیوابە
مەترسە ئێمە تۆ ئەپەرستین
بڕوات پێمانە ئەو ترسە لابە
کەسێ لەگەڵ تۆ خوار و لاری کرد
یا شێتە یاخود مەستی شەرابە
١٩٨٣/٣/١
***

# مەكەن باس

لە دڵداریا تەمەن مەكەن باس
هەتا نەبم من لەو كارە هەراس
تەمەنم زۆرە و دڵیشم لاوە
سەری خۆم ناكەم لەم كارەدا كاس
سەیری مێشك و هۆش و هەستم كەن
كە من خۆم نادەم بە (هەیاسی خاس)
ئە جوانەی كەوا ژیر و زانایە
تەفرە نادرێ بە كەوا و كراس
كێڵگەی ژیانم زەرد نەبووە هێشتا
لە بۆ دروێنەی گەرەك نییەداس
پیشەی دڵداری بەرز و پیرۆزە
بەنرخترە لە كانی ئەڵماس
١٩٨٣/٢/١٢
***

# رۆژی نەورۆز

ئەمرۆ زۆر خۆشە رۆژی نەورۆزە
رۆژێکی یەکجار بەرز وپیرۆزە
لەت لەت کراوە دێوی دڵ تەنگی
تەنها بەدبەختی لە خەم ئاڵۆزە
بەلاّم نازانم ئارامی گیانم
بۆچ وەکو منالٚ ئەمڕۆ گڕۆزە؟
ڕەنگە لە دایکی دلّی ڕەنجابێ
ئەگەرچی بۆ ئەو گەلێ دلّسۆزە
خۆت دەرخە وەکو ڕۆژی ئاسمان
چاوەڕوانی تۆن ئەم گەل و هۆزە
گەر بچیە سەرکەل من هەردێمە لات
گەرچی رێگاکەم هەر تەپ وتۆزە
من ئەو دیمەنەم چەندە لە جوانە
ئەچیە سەر کانی هەلّدەگری گۆزە
لەبیرت ماوە چنم تەمێ کرد..!
کە رێ ی پێ گرتی کابرای بۆزە
ئەوەی من لەتۆ گیانە گەرەکمە
ئاوازی خۆش و دەنگی پڕ سۆزە
١٩٨٣/٣/٢١

***

# نەمامی جاونی

نەمامی جوانی ی دڵداری لە ناو دڵما چەقانوومە
هەموو فرمێسکی خەمباری بەسەر رووما ڕژاندوومە
درەختی من ئەمڕۆ لە چۆڵاَ وشك و بیَ ئاوە
گەلاَی زەردی لە داخا وا بەدەستی خۆم وەرانوومە
بە بادە ئارەزووم وابو کە خەم لادەم لە ناو دڵما
بەلاَم پەرداخ و پیاڵەی مەی بەبیَ هۆشیی شکانوومە
لە ڕووت و قووتیا ڕووم نایە بێمە ناو کەس و یاران
بە پەنجەی شومی بەد بەختی هەچی جلمە دڕاندوومە
کە من بیَ حاڵ و لانەوازم پەست و سەرسامم
نییە تیا بسرەوم ماڵیَ، مەگەر مەیخانە خانوومە
سەرم لیَ تێك چووە وا هاوسەرم زوو کۆچی دوایی کرد
ئومێدی خۆشی ژینم وا لە ناو گۆڕا نوانوومە
***

# دڵی عاشق

دڵی عاشق چاوی هەیە
هەستی زۆر تەواوی هەیە
هەرچی کارێ کە یار ئەیکا
لەلای عاشق باوی هەیە
یار بێ ناو خانەدانی
لەلای ئەو باشتر ناوی هەیە
دانەی خاڵی کوڵمی جوانی
بۆ دڵی من داوی هەیە
ئەوەی زۆر دڵسۆزی ئەوە
هەرمنی داماوی هەیە
١٩٨٤/٩/٤
***

# ئەدەم بە با داخەکەم

ئەی کچۆڵەی جوان و شیرین با بە بادەم داخەکەم
ببمە قوربانت لەبۆم ئامادەکە پەرداخەکەم
لەم ژیانە، لەم جیهانە شادی یە ئامانجی من
هەر لەسەر ئەم هەستە پاکە هەڵ ئەدەم بەیداخەکەم
دەستی من گیانە بنێرە ناو دەستی نەرم و شلت
با لە ناو یا دەروونا دەربەدەربێ ئاخەکەم
من بە بێ ڕووی تۆ ژیانم نەرخ و رێزێکی نییە
بۆ هیوای پڕ شادمانی تۆی گوڵی ناو باخەکەم
وا بە ناو دەشتی هەژاری دا ئەڕۆم سەودا سەرم
جا لەسەر فەرمانی دڵ من ڕوو بە لوتکەی شاخەکەم
١٩٨٣/٨/١١
***

# چی له من ئەکەی

له کوشتن زیاتر چی له من ئەکەی
باقل مێشك و دڵم کون ئەکەی
بەهۆی شیعرەوە کەمێ ناسراوم
بۆچ له نێوانا ناوم ون ئەکەی
من بۆ تۆ هەردەم دوعای خێر ئەکەم
تۆ بۆ من دوعا بۆ مردن ئەکەی
هەموو کەس زانی تۆ چیت به من کرد
چۆن حاشا گیانه له کوشتن ئەکەی
لەگەڵ هەموو کەس کردەوەت باشه
تەنها ناباشی لەگەڵ من ئەکەی
١٩٨٤/٦/٢٨
***

# دڵ دزین

ببمە قوربانی دوو کوڵمی جوان و لێوی قرمزیت
تۆ کە پیشەت دڵ دزینە بۆ چ دڵی من نادزیت
من سەرم سوڕما لە جوانی سنگ و مەمك و گەردنت
تۆ گوڵی باخی بەهاری یاخود خونچەی پایزیت
با هەموو شۆخانی عالەم بێنە لەی تۆ بۆ گرەو
تۆ یەکەم کار دەر ئەچی لەم کارەدا قەت نابەزیت
ئاهی پڕ تینی هەناسەم گڕ لە ئەزمەڕ بەرئەدا
تۆش کە خوێنت هێندە گەرمە قەت لەبەفردا ناتەزیت
من لە گەشت دەشتی ژینا ئاخری ڕوت ئەکەم
گیانە ڕاوچی شارەزام من تۆش بە وێنەی مامزیت
خۆزگە بەو ڕۆژە کەوا لێم تووڕەبووی کاتی بەیان
سەیرە لام بۆ چ وا لە ئەسپی هۆش و ژیری دابەزیت
ناحەزانی تۆ لای من ئاشکرایە بێ گومان
تۆ گوڵی باخی بەهەشتی یا فیشتەی (یولدز) (*) یت
(شاری) تۆ هابەزمی یارانی لەباغ و گۆڵشەنا
ئاخۆ چی رووی داوە ئەمڕۆ بۆچی سەرسام و کزیت
١٩٨٣/٤/٢٤

(*) یولدز: قەسری سوڵتانەکانی عوسمان بوو لەشاری ئەستەمبوڵ لە تورکیا

***

# پێی نەزانیوە

پێی نەزانیوە کە من دڵبەندی جوانی ئەوم
پێی نەزانیوە بە رۆح و دڵ پەرێشان ئەوم
پێی نەزانیوە کاتێ سەیری روخساری ئەو ئەکەم
رووی کە وەك رۆژە لە زومرەی پۆژ پەرستانی ئەم
ئەو بە پۆڵەی خۆی ئەڵێ من ببمە قوربانی دڵت
پێی نەزانیوە منیش هەروا بەقوربانی ئەوم
من کە هەرچەندە ژیان نەرخ و تامێکی هەیە
گەر قبوڵی کا هەتا هەم عەبدو دەبانی ئەوم
ئێمە مەیل و ئارەزووی زۆر خۆشی بریانی و کەباب
من کەوا رۆحم فیدای بێ سینە بریانی ئەوم
١٩٨٣/٥/٤
***

# لێو گەیاندە لێو

لێوم گەیاندە سەر کوڵم لێو
دەستم گەیشتە لای جوتە سێو
بە خۆشی ماچی کوڵم و لێوم کرد
سێویشم گوشی بە بێ بزێوی
لەگەڵ نیگارا ئاشت و هەوڕاین
دوورم لە قین و تانە و جنێو
ئەوەی ناحەزی من و یارم بوو
ئەجوولا وەکو ئاژەڵی کێوی
ئەم حاڵەم ئێستا لەگەڵ نیگارا
خوایە بی هێڵی بەبێ پەشێوی
١٩٨٤/٨/٣٠
***

# بۆچی وا تۆرا لە من؟!

پێی بلێن بەو یارە جوانە بۆچیَ ول تۆرا لە من
من گەلێ بڕوام بەهێزە قەت دڵی نەشکا لە من
ئێستە بیرم کەوتەوە  دویێ شەو روومەت گوڵی
هەر لەبەر ئەم واتە لاتە ئەو دڵی ڕەنجا لە من
من کە ڕۆژ و شەو لە قەسرا یارو هاوبەزمی ئەوم
بۆ شتێکی وا بچووك ئەو حەق نییە لادا لەمن
خۆ ئومێدی شادی ژینم لەم جیهانە هەر ئەوە
چاك ئەبێ هەستی ئەگەر چی زیبزە ئەو ئێستا لە من
کەس نییە وەك بزانێ هاودەمی یاری جوان
من کە دڵبەستەی ئەوینم بۆیە سڵ ناکا لە من
١٩٨٣/٥/٢١
***

# دڵداری بێ دەنگ

دڵداری بێ دەنگ هەر بە چاو ئەکرێ
زۆر بە خشپەی ئاسك ڕاو ئەکرێ
یارێ سەرکەش بێ لە دڵداریا
چاری سەرکەشی هەر بە داو ئەکرێ
ئەو یارەی کەوا توڕە و ناسازە
بەقسەی نەرم و شیرین خاو ئەکرێ
ئەشێ پێی بڵێن یاری خۆ فرۆش
ئەوەی بە زێڕ و پارە تاو ئەکرێ
یارێك خەڵەتا بە درۆی بەدکار
لە دنیا ژینا زوو بەدناو ئەکرێ
ئەو یارەی کەوا ڕەوشتی پاکە
لەجارێك زیاتر سەد سڵاو ئەکرێ
١٩٨٣/٦/١٩
***

# هەستە ڕاوەستە

هەستە ڕاوەستە با تەماشات کەم
سەیری ڕوومەت و بەژن و باڵات کەم
ئەوسا دانیشە لەسەر ڕانەکەم
تێروپڕ ماچی دەم و گۆنات کەم
دڵم پێداوی خۆت ئاگاداری
دەبا ڕۆحیشم بەتۆ خەڵات کەم
هەرچی کە هەمە لەماڵ و سامان
لەگەڵ ژیانماگشتی فیدات کەم
هەرتۆ سەرمایەی بەختیاریمی
ئیتر بۆ چ لە دەس بەختم شکات کەم
خوایە تۆی بەخشی تاجی جوانی
بۆ عەرشی جوانی بۆ چ بەتەمات کەم
هاتی بەخێر بێیت، خۆ گەر نەشهاتی
نابێ من باسی هات و نەهات کەم
١٩٨٣/٦/٢٦
***

## چاوەکانت

فیدات بم چاوەکانت دڵ رفێنە
دڵی من چاوەڕوانە لێم بسێنە
بەشێواوی جوانە پرچەکانت
بە قوربان سا بە شانە دای مەهێنە
وتاری تۆ وەکو گەوهەر بەنرخە
بەڵام دایکت وتاری دڵ شکێنە
کە تۆم لێ دووربی ئەگریم چەشنی ساوا
هەموو فرمێسکی چاوم سووری خوێنە
هەموو پەسمانی تۆ یاسای ژیانە
درۆیان فەموو گوتیان بێ بەڵێنە
سەر سوڕماوە لە ئاڵی کوڵ لێوت
لە جوانیدا نیانە چەشن و وێنە
ئەگەر گوڵ هات و لافی جوانی لێدا
بەپەنجەی خۆت پەڕەی گوڵ هەڵوەرێنە
١٩٨٣/٧/١
***

# ماندوو ئەبم

که شوێنت کەم زوو ماندوو ئەبم
ئەو کاتە خۆشە ڕووو بە ڕو ئەبم
من دوور بە دووریش کە تۆ ئەبینم
مەستێکی خۆشی زوو بە زوو ئەبم
وادەم ئەدەیتێ گیانە دێمە لات
خێر ئاشنای ئارەزوو ئەبم
فەرمووت ئەمەوێ هەر من تۆبین
هاوڕازی بەزمی دوو بە دوو ئەبم
منیش ئەو کارەم لە یەزدان ئەوێ
گەر سەرکەشی کەم بەدخوو ئەبم
لەرێی دڵداری تۆی بێ وێنەدا
باسی سامان کەم چەشنی جو ئەبم
گەر خۆت نیشاندەی بە تاقە یارم
سەرۆکی بەرزی لای سەرو ئەبم

***

## نامەیەکی شیعری لە ( فیدا ) وە بۆ ( شاری )

بە ناوی یەزدانی یەکتا

بۆ - زۆر بەڕێز مامۆستا و هۆنەری بەرزمان جەنابی عەلی عارف ئاغا

کاک عەلی عارف ئاغا نازناوت شاری     یاخوا نەبینی غەم و بێزاری
هۆنراوەکانت پڕ سۆز و جوانن     خۆش و بەتام و سادە و ڕەوانن
دیارە ژیانت پڕ لە ناسۆرە     بۆیە هۆنراوەت لە هەموو جۆرە
مامۆستای بەڕێز هەر بەتەنیا تۆ     لە جەرگت نایە پەروەزە و بۆسۆ
هەرچی شاعیرە وەکوو تۆ وایە     دڵی پڕ غەم و تاسە و هەوایە
گەر لە حاڵی من ببی ئاگادار     گلەیی ناکەی قەت لە ڕۆژگار
دیوانەکەتم خوێندەوە هەموو     لەگەڵی شیعری سەرەم دەرنەچوو
مانا لە دڵت شاعیرا نایە     بەڵام لێی دەگا هەمووی زانایە
دیارە هۆنراوەت زۆرە و بێ ژمار     دەی نووسی لە شەو و ڕۆژا نامەو گوتار
کۆمەڵ بە کۆمەڵ بە یارمەتی خوا     لە چاپیان بدە بە بیر و بڕوا

فیدا . ی شەیدای دڵسۆزی تۆیە
بۆیە بۆی نووسیت ئەم گفتوگۆیە

تێبینی : - ببوورە . ناونیشانتم نەدەزانی بۆیە بەهۆی چاپخانەی کامەرانییەوە ئەم نامەم پێشکەش کردی . سەرکەوتوو بی .

دڵسۆزت . محمد فیدا
١٩٨٠/٤/١٥

ناونیشان : -
قەڵادزە - محمد فیدا .



تشرينی دووەمی ١٩٨٧

قادر برسی، عەلی عارف ئاغا (شاری)، جیهان عەلی ئەمین



**بەختیار زێوەر**

**١٩٠٨-١٩٥٢/١٢/٣١**

**یەکەم هاوڕێی نزیکی عەلی عارف ئاغا**

## بیرەوەریەکی ساڵی هەشتاکان
## لە ڕۆژنامەی هەرێمی کوردستان ١٩٩٧ بڵاو کراوەتەوە

# ئەو دەمەی بیرەوەرییەکان دەبنە گزنگ

ئەحمەد حسێن ئەحمەد

مامۆستای دەرچەدوو شاعیر عەلی عارف ئاغا کەسێکی کراوەو بیرتیژو ڕاستگۆو ئەرتیست بوو.. لە گەرمەی دانیشتندا ئەم پرسیارەم ئاراستە کرد.

_ مامۆستا ئایا جەنابت سەرکردەی لیهاتوو ئیسماعیل ئەدەی شوکاک _ سمکۆ _ ت بینیبوو؟ _ دوای ئەختێ ڕامان.. بە شینەیی وتی.

بەڵێ با بگەڕێینەوە بۆ سەرەتای بیستەکان. ئەودەم لە پۆلی سێیەم یان چوارەمی سەرەتایی بووم. لەلایەن حکومەتی کوردستانەوە لەسەر خواستی مەلیک مەحمودی ئەوەل ئاگەهیشت کرابوو تەشریفی بە (٧٠ــ ٨٠) سوارێکەوە لە دەوری گوندی ویلنە دەرەوە هاتن بۆ ناو شار. ئیمەش ئاگادار کرابین و ئامادە بووبین. تێکڕای شاگردو (قوتابی) ومامۆستاو بەشێکی زۆر لە دانیشتوان بەرەو پیریان چووین.



ئەحمەد ڕەزبەکی گەورەبیان لێ گرت

سمکۆ زەلامێکی بۆشاخ و بەهەیبەت بوو. قاتی شاڵو شەپکی لەبەردابوو. گەلێک سروود و گۆرانیمان بۆ وت شایانی باسە (ئەحۆڵ) لە بەردەمیدا بە بەرگێکی قەشەنگەوە بە حەرەکەتەوە سروودێکی بۆ خوێندەوە. سمکۆ لە خۆشیدا دەگریا. لەگەڵ مەلیک مەحموددا ئافەرینی هەموومانیان کرد. ئیدی مەلیک مەحمود و سمکۆ دەستیان کردە ملی یەك... جۆشی ڕەتەنییەت وقەومییەت لە ئارادا بوو... دوایی بە مەراسیمەکەهات. ئینجا بە هەناسەیەکی ساردەوە وتی: دەریغ بۆ ئەو ڕۆژو زەمانیە...

# (ئەسیری)م چۆن ناسی

ئەحمەد حسێن ئەحمەد

رۆژی (١٩٨٧/٥/٥) لە یادەی شاعیری نیشتمان پەروەری کورد (عەبدولخالیقی ئەسیری) پرسیارێکم لە شاعیر (عەلی عارف ئاغا) کرد. لە وەلامدا ئەم بیرەوەرییەی بۆ نووسیمەوە: لە پێشی ئەوەدا مامۆستا عەبدولخالیق ئەسیری بناسم، لە نزیکەوە هەندێک لە ئەشعارە نیشتمانیەکانیم لە دەستکەوتبوو و نووسیبوومەوە زۆر دڵبەند بووم بەو ئەشعارەوە کە سەراپا پڕبوو لە هەستی بەرزی کوردایەتی و نیشتمان پەروەری

لە ساڵەکانی (١٩٣٦ـ١٩٣٨) بە کارگوزاری میری لە کەرکوک بووم. لە دادگای کەرکوک لە بەشی (تیجرا) نووسەر بووم، خوالێخۆشبوو (ئەسیری)یش لە بەشی (شەرعیە) نووسەر بوو، کە پێم زانی بوو، چوومە لای و خۆم پێی ناساند، بە جۆرێک ڕێزی لێگرتم کە وێنەی نەبوو. ئەڕەوویی من خەڵکی سولەیمانیم زۆر خۆش دەوی، چونکە بەشی زۆریان خاوەن هەستی بەرزی ئەدەبایەتین هەروەها شاعیری هەڵکەوتوو و پایەبەرزیان هەیە. وتم: مامۆستا وەکو کێ؟ ئەڕەوویی وەکو سالم و نالی و زێوەر و بێخود و تۆفیقی و حەمدی و گەلێکی تر کە ئێستا ناویانم لەبیرنەماوە. لێم پرسی مامۆستا شیعرەکانت هەمووی نیشتمانین یاخود بابەتی کۆمەلایەتی و دڵداریشت هەیە؟ وتی: هەمە ڕەنگە، شیعرم هەیە. هەندێک لەو شیعرانەی بۆ خوێندمەوە زۆر جوان و پڕ مەعنا بوون.

ئەوکاتەی کە بینیم تەمەنی لە (٥٠) ساڵ زیاتر بوو زمانی عەرەبی و فارسی و تورکی و کوردی ئەزانی، وەکو بیستبووم ژنی نەهێنابوو، چونکە چەند خوشکەزایەکی بێ باوکی هەبوو بە خێوی دەکردن. زۆر تەربیەتی ئەدان، هەتا پێی گەیاندن و بوون بە ئەندامێکی بەڕێز بە چینی کەلی کورد.

سەرچاوە / هەفتەنامەی (ئاڵای ئازادی) ژمارە ٢٥٣

لە ١٩٩٧/١٠/٢٧

## پێرست